

حکومەتی هەرێمی کوردستان - عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی

حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەك لە وازەرەتی پەروەردە

بژارکردن و دارشتنەوەی هەردوو بەشی ڕێزمان و ئەدەب

یاسین عوسمان حەسەن
شێرکۆ ئەحمەد حەوێز
ڤارتێکس مۆسیس سەرکیسیان
محەمەد ئەحمەد محەمەد
ئەڵمان ئەحمەد سەلیم

چاپی دووەم
٢٧٠٨کوردی
٢٠٠٨ز

# پێشەکی:

وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی عیراق لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ پێداچوونەوەو بژارکردنی پەرتووکی زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی، لیژنەکە دەستی بە کارەکانی کردو، بەتایبەتی دەستکاری هەردوو بەشی ڕێزمانو ئەدەبی کرد. بەشی ڕێزمانی ئەم پەرتووکە بە جۆرێکی وا داڕێژراوە کە نموونەی لە هەردوو زارە سەرەکییەکەی زمانی کوردی تێدابێت، بۆ ئەوەی قوتابییانمان هەر زوو شارەزای هەردوو زاری سەرەکی زمانەکەیان بنو هەروەها بۆ ئەوەش کە بیسەلمێنین زمانی کوردی لە بنچینەو بنەما سەرەکییەکانیدا یەك زمانەو ئەو جیاوازییەی لە نێوان زارەکانیدا هەیە ئەوەندە نییە کە ببێتە جێی مەترسی.

داوا لە مامۆستایانی بەڕێزی بابەتەکە دەکەین کە بایەخێکی زۆر بە چۆنیەتی خستنە ڕوو و گوتنەوەی بەشی ڕێزمانی ئەم پەرتووکە بدەن، نموونە لە هەردوو زاری سەرەکی زمانی کوردی بخەنە بەردەم قوتابیانو خوێندکارانو بەرپرسیان بکەن بەرامبەر ئەو نموونانە، وا بکەن قوتابیانو خوێندکاران بکەن بە دۆستی زمانەکەیانو گیانی لێکۆڵینەوەو تیشك خستنە سەر هەموو کون وقوژبنێکی زمانەکەیان بخەنە دڵیانەوە.

بەشی ئەدەبەکەش، دەستکارییەکی تەواوی تێدا کرا، ژیانی شاعیرانو نووسەران بەدرێژی باسکراوەو نموونەی شیعرو پەخشانی ئەوانی تێدایە لەگەڵ هەر نموونەیەکیش ئەو بڕە شیعرە یان پەخشانەمان نیشان داوە کە دەبێ قوتابی لە بەری بکات تکامان لە مامۆستایان ئەوەیە کە پابەند بن بەم دەست نیشان کردنە.

دیارە هیچ کارێکیش بێ کەمو کورتی نابێ، بۆیێ داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین، هەر جۆرە کەمو کورتیو ناتەواوییەکی بەرچاویان دەکەوێ، تۆماری بکەنو بە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی پارێزگەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە، بۆ ئەوەی تبێبینیو پێشنیازەکانیان بخەینە بەرچاو.

**لیژنەی بژارکردنو داڕشتنەوە**

# ڕوونکردنەوە

وەزارەتی پەروەدەی حکومەتی یەکگرتووی هەرێمی کوردستان بە فەرمانی وەزاری ژمارە ١٤٥٧ لە ٢٠٠٧/٢/٨ لێژنەی پێکهێنا بۆ یەکخستنەوەی پەرتووکەکانی زمانو ئەدەبی کوردی هەردوو قۆناغی ناوەندیو ئامادەیی لەسەرتاسەری قوتابخانەو خوێندنگەکانی هەرێمی کوردستاندا. لێژنەکە دەست بەکاربوو، هەردوو پەرتووکی زمانو ئەدەبیو کوردی (ئیدارەی جارانی هەولێرو سلێمانی) کردە بنەمای ئەم یەکخستنەوەیە، بە لەبەر چاوگرتنی بەپێزییو بەهێزیی بابەتەکانی ناو ئەم دوو پەرتووکەو لەئەنجامدا ئەم پەرتووکەی لێ کەوتەوە، کە بەشی هەرە زۆری هەردوو بەشی ڕێزمانو ئەدەبەکەی لەلایەن لێژنەیەکی پێشووتری دارشتنەوەو بژارکردنی ئەم دوو بەشە ئامادەکرابوو، لەبەر ئەوە وا بە پەسند زانرا کە مافی ئەوانیشی بەسەرەوەبێت، هەروەها ئاماژە بە سەرچاوەی ئەو بابەتە گۆڕاوانەش کراوە کە هاتوونەتە ناو پەرتووکەکەوە، بۆیە داوا لە مامۆستایانی خۆشەویستی بابەتی زمانو ئەدەبی کوردی دەکەین کە دڵسۆزانە پا بەندی ناوەڕۆکی ئەم پەرتووکە بنو هەر کەمو کورپییەکی هەبێت بەهۆی پەروەردەکانی خۆیانەوە ئاگاداری بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرامەکان بکەن لە وەزارەتی پەروەردە.

﴿ هیوادارین خوای گەورە هەموو لایەك سەر بخات ﴾

**لێژنە**

٢٠٠٧/٤/١٥

# «بەشی ڕێزمان»

١. کەرەستەکانی نووسین

٢. دەنگەکانی زمان و پیتەکانی وشە

٣. شێوەکانی وشە

٤. بڕگەکانی پەیڤ (وشە)

٥. جیاوازی نێوان ڕستەو گرێ

٦. جۆرەکانی ڕستە (ڕستە بە پێی ناوەڕۆك)

٧. ڕستەی ڕاگەیاندن: أ- ڕستەی ئەرێ    ب- ڕستەی نەرێ

٨. ڕستەی پرس

٩. ڕستەی سەرسوڕمان

١٠. بنچینەکانی ڕستە:

أ- (بکەر) کاری تەواو    ب- (نیهاد) کاری ناتەواو

١١. کار: أ- کاری تەواو    ب- کاری ناتەواو

١٢. دیارخەری ناو- تەواوکەری کار

١٣. ناو

١٤. جۆرەکانی ناو:

أ- ناو لەڕووی ناوەڕۆکەوە (ناوی تایبەتی، گشتی، کۆمەڵ)

ب- ناو لەڕووی هەبوونەوە (ناوی بەرجەستەو ناوی واتایی)

١٥. ئەرکی ناو لەڕستەدا:

١٦. جێناوی کەسی سەربەخۆ:

( أ ) جێناوی کەسی سەربەخـۆ

( ب ) جێناوی کەسی سەربەخۆ

( ج ) جێنای کەسی سەربەخـۆ

١٧. چاوگ

١٨. کار لەڕووی دەم و کاتەوە:

أ. کاری ڕابوردوو ( بۆری )

ب. کاری ڕانەبوردوو

ج. کاری داخوازی

# کەرەستەکانی نووسین

| -ئـا- | -ب- |
|---|---|
| پیت | ڕستە |
| ↓ | ↓ |
| بڕگە | گرێ |
| ↓ | ↓ |
| وشە | وشە |
| ↓ | ↓ |
| گرێ | بڕگە |
| ↓ | ↓ |
| ڕستە | پیت |

لە قۆناغی سەرەتاییدا کەرەستەکانی نووسینتان خوێندووە، ئـەویش لە بچووکترین کەرەستەوە کە (پیت)ە، ئنجا بـە لێکدانی دوو پیـت یـان زیاتر (بڕگـە)تـان دروسـت کـردووە، پاشـان لـە بڕگـەکانیش (وشـە)تـان دروست کردووەو دوو وشە یان زیاتریشتان داوەتە پاڵ یەکترو (گرێ)تان دروسـت کـردووە، ئەمانەشـتان بـە چـەند قۆنـاغێکی یەکبـەدوای یەکـدا خوێندووە تا وەکو توانیوتانـە (ڕسـتە)ش دروسـت بکـەن، هـەر وەك لـە خشتەی -ئا-دا بە ئاشـکرا لـە بـچووکترین کەرەسـتەوە بـۆ گـەورەترین

کەرەستەی نووسین فێرکراون، بەڵام خوێندکاری خۆشەویستم ئەم ساڵ لە قۆناغی ناوەندیدا بە شێوەیەکی تر بە بابەتەکەدا دەچینەوە کە لە گەورەترین کەرەستەی نووسینەوە بۆ بچووکترین کەرەستە دووبارە دەیانخوێنن، هەر وەك لە خشتەی (ب)دا بە ئاشکرا دیارە.

## ڕاهێنان
### (گری، پیت، وشە، ڕستە، بڕگە)

١. ئەم کەرەستانە لە بچووکترین کەرەستەوە بۆ گەورەترین کەرەستە ڕیز بکە.

٢. بچووکترین کەرەستەی نووسین چییە؟

٣. لە پیت گەورەتر چییە؟

٤. لە (بڕگە) گەورەتر چییە؟

٥. دوو وشە بەهۆی ئامرازی خستنەسەری (ی)یەوە بدرێتە پاڵ یەکتر چی دروست دەبێت؟

٦. گەورەترین کەرەستەی نووسین چییە؟

٧. ئەمجارە کەرەستەکانی نووسین لە گەورەترین کەرەستە بۆ بچووکترینیان ڕێز بکە.

## لێكدانەوەی وشەكان:

| وشە | : | پەیڤ |
|---|---|---|
| خۆشەویست | : | خۆشتڤی |
| گەورە | : | مەزن |
| بچووك | : | بچیك |
| ئەمجارە | : | ڤی جارەی |

(وانەی دووەم)

# دەنگەکانی زمان‌و (پیتەکانی وشە)

١. داری ئازادی بە خوێن ئاو دەدرێت.

٢. سیروان ڕووبارێکی کوردستانە.

٣. برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لەلای خوا بێت.

٤. کۆمەڵە شاخێك سەخت‌و گەردن کەش

ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش

ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەو ڕستانەی سەرەوە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر یەکەیان لە چەند وشەیەك پێکهاتووە، کە بەشێوەیەکی تایبەت ڕێز کراون‌و دراونەتە دەم یەکترو واتاو مەبەستێکی تەواو دەبەخشن، وشەکانی ئەم دێڕانەش هەر یەکەیان لە بڕگەیەك یان چەند بڕگەیەك پێکهاتوون، بڕگەش بەهیچ شێوەیەك بەبێ بزوێن نابێت.

ئەگەر ئەو بڕگانە زیاتر شیبکەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر بڕگەیەك لە چەند دەنگە زمانێك پێکهاتوون، بۆ نموونە بڕگەی (دا) لە هەردوو دەنگی (د)و (ا) پێکهاتووە، کە هەر یەکەیان دەنگێکە لە دەنگەکانی زمانی ئادەمیزادو بەم پێیە هەموو زمانێك کۆمەڵە دەنگێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە بە هۆیانەوە وشەو ڕستەکان دروست دەکرێن دەبنە مایەی گفتوگۆو ئاخاوتن لە نێوان کەسانی سەر بە یەك زماندا، ئەو دەنگانەش دیارە هەر یەکەیان شێوەی دەربڕین‌و هاتنە دەرەوەیان،

له ئەندامی ئاخاوتن، (قورگ، زمان، ددان، لێو،... هتد) هەر یەکەیان بە گوێرەی خۆی بەشداری تێدا دەکات. ئەو دەنگانەی کە تایبەتن بە زمانی کوردی بۆ هەر یەکەیان هێمایەك (نیشانە)یەك دانراوە کە بە پیت ناو دەبرێن، بۆ ئەوەی لە کاتی نووسیندا بناسرێنەوە، بۆ وێنە، دەنگی (ك) کاتێك لە دەم دێتە دەرەوە، تەنیا جۆرە ئاوازێکەو بە گوێ دەیبیستینو هەستی پێ دەکەین.

هەر کۆمەڵە مرۆڤێك هاتووەو هێمایەکی بۆ داناوە، بۆ نموونە لەلای هەندێ لەو کۆمەڵە مرۆڤانە ئەم دەنگە بە هێمای (ك)و لەلای هەندێکی تریش بە هێمای (k)و لەلای خەڵکانی تریش بە هێمای جیاواز لەم دوو هێمایە دەستنیشان کراوە. ئەو هێمایەی کە بۆ هەر یەك لە دەنگەکانی زمان دانراوە لای ئێمە بە (پیت) ناو دەبرێت، زۆرجاری وایش هەیە (تیپ)ی پێ دەڵێن.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە پیت هێماو وێنەی ئەو دەنگانەیە، کە لە نووسیندا بەکاردێن، دەنگەکانی زمانیش هەیانە لە دەربڕیندا گرانو هەیانە ئاسانە. بەم شێوەیە دەتوانین دەنگەکانی زمانی کوردی بکەین بە دوو کۆمەڵەوە.

١. **دەنگە نەبزوێنەکان:** هەموو ئەو دەنگانە دەگرێتەوە کە دەربڕینیان گرانەو بە یارمەتی دەنگە بزوێنەکانەوە لە دەم دێنە دەرەوە بۆ هەر یەکێك لەم دەنگانە وەك لەسەرەوە باسکرا، هێمایەکی تایبەت دانراوەو پێی دەگوترێت (پیت).

کەوابوو دەتوانین دەنگە نەبزوێنەکانی زمانی کوردی بەم شێوانەی خوارەوە بنووسین (ئـ، ب، پ، ت، ج، ح، خ، چ، د، ڕ، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، هـ ، و، ی) لێرەدا بۆمان دەرکەوت، کە ژمارەی ئەو دەنگانە (٢٩) دەنگەو بەو هێمایانەی کە بۆ هەر یەکێك لەو دەنگانە دانراوە دەگوترێت پیت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەزمانی کوردیدا (٢٩) پیتی نەبزوێن هەیە.

٢. **دەنگە بزوێنەکان:** هەموو ئەو دەنگانە دەگرێتەوە، کە بە ئاسانی لە دەم دێنە دەرەوەو یارمەتی دەنگە (نەبزوێن)ەکان دەدەن بۆ ئەوەی بە ئاسانی بێنە گوتن و دەربڕین. ئەم دەنگانەش هەر وەك دەنگەکانی کۆمەڵەی یەکەم بۆ هەر یەکەیان هێما (نیشانە)یەك دانراوە، بۆ ئەوەی بنووسرێن و بخوێنرێنەوە، دەنگە بزوێنەکانیش ئەمانەن: (ا،ە ، و، ۆ، وو، ی، ێ، i ) بەو هێمایانەش کە بۆ هەر یەکێك لەو دەنگانە دانراوە پێی دەگوترێت (پیت)، ژمارەی ئەم دەنگانەش (٨) دەنگەو هەر دەنگە هێمای تایبەتی خۆی هەیە، وەك لەمەو پێش بەرچاومان کەوت، کە واتە بە هێمای نووسراوی ئەو دەنگانە دەڵێن (پیتە بزوێن)ەکانی زمانی کوردی، وە لە پیتە بزوێنەکاندا بزوێنی کورتی ( i ) هەیە، کە بەم (ئەلفبێ)یەی ئێستا پێی دەنووسین هێمای تایبەتی خۆی بۆ دانەنراوە، وەك ئەو بزوێنە کە لەم وشانەی (ژن، من، مل، دڵ، شل، کل،.... )دا هەن و پیتە (بزرۆکە)کە کەوتۆتە نێوان هەردوو پیتە نەبزوێنەکانەوە، بەڵام دەریش نەکەوتوون، چونکە هەر وەك ئاماژەمان پێدا بە نووسینی

ئەم پیتی (ئەلفبێ)یەی ئێستامان دەرناکەون، کەچی بە نووسینی پیتی لاتینی زۆر بە ئاشکرا دەردەکەون، وەك (jin, min, mil, dil, şil, kil,...) وە هەر لەبەر ئەوەی ئەم بزوێنە زۆر کورتەو هێمای تایبەتی خۆی نییە، بۆیە پێی دەگوترێت (بزرۆکە).

تێبینی/ چۆن پیتی (و- ی)ی نەبزوێن لە پیتی (و-ی)ی بزوێن جیا دەکەینەوە؟؟!

١. پیتی (و- ی)ی بزوێن هەرگیز لەسەرەتای وشەو بڕگەوە نایەن و ئەوەی لەم شوێنانەدا هات بێگومان پیتی (و- ی)ی نەبزوێنە، وەك (وەرزش، وازی، والاّ، یاری،...).
٢. هەر کاتێك لە پێش و لەدوای پیتی (و- ی)یەوە پیتێکی بزوێن هەبێت، ئەوا ئەم (و- ی)یە بێگومان دەبنە پیتی نەبزوێن وەك (سێو، شێو، لاو لاو، تاو تاو،...).
٣. ئەگەر لە پێش یان لەدوای پیتی (و- ی)یەوە پیتێکی (نەبزوێن) هاتبێت ئەوا ئەم (و- ی)یە دەبنە پیتی (بزوێن) وەك (کورد، دەستگوشین، بڕین، فڕین،...).
٤. هەرگیز لە زمانی کوردیدا دوو پیتی (بزوێن) بە دوای یەکدا نایەن.

## دەستوور:

دەنگ: بچووکترین دانەی ئاخاوتنە، کە لە دەم دێتە دەرەوە.

پیت: ئەو هێما تایبەتییانەیە، کە بۆ هەر یەکێك لە دەنگەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ دانراوە، واتا (پیتەکان وێنەی دەنگەکانن) پیتەکانیش بە گشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١. پیتە نەبزوێنەکان: ئەو پیتانەن کە لەدەربڕینو ئاخاوتندا گرانن‌و بە هۆی پیتە بزوێنەکانەوە لە دەم دێنە دەرەوەو ژمارەیان لە زمانی کوردیدا (٢٩) پیتە.

٢. پیتە بزوێنەکان: ئەو پیتانەن کە بە ئاسانی لە دەم دێنە دەرەوەو یارمەتی پیتە نەبزوێنەکان دەدەن بۆ ئەوەی بە ئاسانی بێنە گوتن‌و ژمارەیان لە زمانی کوردیدا (٨) پیتە، کە لەناو خۆیاندا دەبن بە دوو جۆرەوە:

أ- پیتە بزوێنە کورتەکان: (بزرۆکە، ە، و، ی).

ب- پیتە بزوێنە درێژەکان: (ا، ۆ، وو، ێ).

## لێکدانەوەی وشەکان:

ئاخاوتن : ئاخافتن ، پەیڤین

بنووسرێنەوە : بهێتە نڤیسین

پێیدەگوترێت : دبێژنێ

بە ئاسانی : بسانایی، بساناهی

ئێستا : نووکە، نهۆ، هەنوکە

## ڕاهێنانی (١)

پیتە بزوێنو نەبزوێنەکان لەم وشانەدا دەربهێنە:

(گەلا، کەیبانوو، بەڕوو، کارێز، دۆ، گڵە زەردە، هەنگ، کورد، گەنم، کەروێشك، کەوچك)

## ڕاهێنانی (٢)

ژمارەی پیتە بزوێنەکان چەندە؟ بیاننووسەو بۆ هەر یەکەیان دوو وشەی جیاواز بە نموونە بهێنەرەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەرەوە:

١. ئایا دەگونجێت پیتی بزوێن بکەوێتە سەرەتای وشەو بڕگەوە؟

٢. ئایا لەزمانی کوردیدا دەگونجێت دوو پیتی بزوێن بە دوای یەکدابێن؟

٣. جیاوازی لە نێوان پیتی (یـ) سەرەتایی وشەی (یاری)و پیتی (یـ) لە وشەی (میر)دا چییە؟ ڕوونی بکەرەوە.

٤. پیتی (و) لە دوو وشەدا بهێنەرەوە بە مەرجێك جارێك (بزوێن) بێتو جارێك (نەبزوێن).

(سەرچاوە: زمانو ئەدەبی کوردی

پۆلی یەکەمی ناوەندی– سلێمانی)

(وانەی سێیەم)

# شێوەکانی وشە

-ب- وشەی ناسادە

| -ئـ- وشەی سادە | وشەی داڕێژراو | وشەی لێکدراو |
|---|---|---|
| کورد | کوردستان | کورد زمان |
| داس | داسوولکە | تەورداش |
| ڕەش | ڕەشۆکە | ڕەشماڵ |
| ڕۆژ | بە ڕۆژ | ڕۆژهەڵات |
| دەم | بێ دەم | گوڵ بەدەم |
| ئاسن | ئاسنگەر | سەر ئاسن |
| چاو | چاویلکە | چاوکاڵ |
| دڵ | نا بەدڵ | دڵخۆش |
| کردن | کردنەوە- هەڵکردن | چاککردنەوە |
| دار | دارەوان | دارگوێز |

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە گوتراوەکانی ڕیزی (أ) دەبینین هەر یەکەیان شێوەیەکەو لە چەند پیتێکی ڕیزکراو پێکهاتووەو ئەم پیتانە بەسەر یەکەوە واتایەکی تەواویان دروست کردووەو بە هەر یەکێکیان دەگوترێت

(وشه). ئەم وشانە زۆر سادەو ساکارنو هیچ زیادەیەك (پێشگر، پاشگر) نەچۆتە سەریان و تەنیا یەك مەبەستیان تێدا بەدی دەکرێت، بۆیە بە هەر یەکێك لەمانە دەگوترێت (وشەی سادە)و دەتوانین بە ئاسانیو بەپێی پێویست هەر یەکەیان لە ڕستەدا بەکاربهێنین، هەروەها ئەم جۆرە وشانە بنجینو بەشێکی زۆری وشەکانی دیکەی زمان لەمانەوە وەردەگرین.

ئەگەر بڕوانینە وشەکانی ڕیزی (ب) دەبینین هەر یەکەیان پێیان دەگوترێت (وشەی ناسادە)، کە ئەویش دەبێت بە دوو جۆر:

١- (وشەی داڕێژراو) ئەم جۆرەش لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشێکیان بنجیو واتادارەو ئەوی دیکەیان زیادەیەو بێ واتایەو بە هەردووکیان بەسەر یەکەوە وشەیەکی نوێیان بۆ واتایەکی نوێ دروستکردووەو داڕشتووە، بۆ نموونە وشەی (کوردستان) لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی (کورد) کە وشەیەکی بنجی سادەی واتادارەو سەربەخۆ دەتوانرێت لە ڕستەدا بەکاربێتو بەشی (ستان) کە ئەمەیان زیادەیە (پاشگر)ە خراوەتە دوای وشەی (کورد)ەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان وشەیەکی نوێ لە واتاو مەبەستدا دروست بکەن. جگە لەوەش (هەڵکردن)یش، دیسان لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی (کردن) کە وشەیەکی بنجی سادەی واتادارەو سەربەخۆ دەتوانرێت لە ڕستە بەکاربێتو بەشی (هەڵ) کە زیادەیە (پێشگر)ەو خراوەتە پێش وشەی (کردن)و بە هەردووکیان وشەیەکی نوێیان لە واتاو مەبەستدا دروست

کردووه. جا بەم جۆرە وشانەی کە بەو شێوانەی سەرەوە دەکرێن دەگوترێت وشەی (داڕێژراو)

٢- ئەگەر سەیری گوتراوەکانی ڕیزی (وشەی لێکدراو) بکەی دەبینین هەیانە تەنیا لە دوو وشەی سادەی واتادار پێکهاتوون و واتەیەکی نوێیان بۆ مەبەستێك دروستکردووە، وەك (چاوکاڵ، دڵخۆش، کوردزمان...).

هەیانە لەدوو وشەی سادەی واتادار یان زیاتر پێکهاتووە، و بە هۆی ئامراز یان زیادەیەك واتایەکی نوێیان بۆ مەبەستێکی نوێ دروستکردووە، وەك (گوڵ بەدەم، چاوکاڵ، چاك کردنەوە...).

جا بەم جۆرە وشانە کە بەو دوو شێوازە دروستدەکرێن دەگوترێت (وشەی لێکدراو).

## دەستوور:

**وشە لە ڕووی شێوەو (جۆر)و پێکهاتنەوە دوو جۆرە:**

**أ- وشەی سادە: ئەو گوتراوەیە، کە بە لێدانی چەند پیتێك پێکهاتووەو بە شێوەیەکی تایبەت خراونەتە پاڵ یەك و شێوەیەکی سادەو ساکارو واتایەکی تەواوی هەیە.**

**ب- وشەی ناسادە: ئەمەش دەبێت بە دوو جۆر:**

**١. وشەی داڕێژراو: ئەو گوتراوەیە، کە تەنیا لە یەك وشەی سادەی واتادارو زیادەیەك (پێشگر، پاشگر) پێکهاتووەو واتایەکی نوێی بۆ مەبەستێکی نوێ دروستکردووە.**

٢. **وشەی لێکدراو:** ئەو گوتراوەیە، کە لە دوو وشەی سادەی واتادار یان زیاتر پێکهاتووەو واتایەکی نوێی بۆ مەبەستێکی نوێ دروستکردووە.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم وشانەی خوارەوە چ جۆرێکن؟ دیارییان بکە.

(هەورە بروسکە، بردنەوە، مەلەوان، قژ زەرد، قرژاڵ، مانگ، کوێستان، نانەوا، داگرتن).

## ڕاهێنانی (٢)

لە هەر یەکێك لەم زیادانە (٣) وشەی داڕێژراو دروست بکە.

(ەوە، هەڵ، ستان، ڕا، بە، دا )

## ڕاهێنانی (٣)

لە هەر یەکێك لەم وشە سادانەی خوارەوەدا وشەی لێکدراو دروست بکەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

(گوڵ، کانی، گەڵا، بەرد، هەرمێ، تەور، سپی)

## ڕاهێنانی (٤)

١. وشەی سادە چییە؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

٢. جیاوازی لەنێوان وشەی داڕێژراوو وشەی لێکدراودا چییە؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنانی (٥)

لەم زیادانە پەیڤی داڕێژراو دروست بکە:

(ڤە، ەوە، هەڵ، ستان، ڤان، را، بە )

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| داسولکە | : | داسا بچیك |
| چاککردنەوە | : | چێکرنەڤە |
| دارەوان | : | دارڤان |
| گوڵ بەدەم | : | کولیلك |

(سەرچاوە: زمانو ئەدەبی کوردی
پۆلی یەکەمی ناوەندی- سلێمانی)

# بڕگەکانی پەیڤ (وشە)

١. ئاوی کانی سازگارە.

٢. مرۆڤ بکاری شرینە.

٣. قەراج دەشتێکی پان و بەرین و بە پیتە.

٤. هەڤالیٚ من نەهاتیە.

٥. ئاشتی هیوای گەلانە.

٦. بێکەس شاعیرەکیٚ ب ناڤ و دەنگە.

٧. دەست پاکی ڕەوشتێکی چاکە.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ئەو وشانەی کە ئەم ڕستانەیان لیٚ پێك هاتووە، دەبینین کە هەر وشەیەك بریتییە لە چەند دەنگێك کە بە یارمەتیی دەنگ و پیتە بزوێنەکان دەگوترێن و دەنووسرێن. وەك:

١. (ئا– وی، کانی– نی، ساز– گا– رە،)

٢. (م– رۆڤ ، ب– کا– ری، شـ – ریـ– نە،)

٣. (قە– راج، دەشـ– تێـ– کی، پا– نو، بە– ریـ– نو، بە– پیـ– تە،)

٤. (هە– ڤا– لیٚ، من، نە– ها– تی– یە،)

٥. (ئاشـ – تی، هیـ–وای، گە– لا– نە، )

٦. (بیٚ– کەس، شا– عیر– رە– کیٚ، ب، ناڤ – دەن– گە،)

٧. (دەست– پا– کی، رە–وشـ– تێـ–کی، چا– کە، ).

{ئینجا ئەو دەنگەی یا ئەو دەنگانەی کە بەیەك جارو بەسەر یەکەوە بە یاریدەی پیتێکی بزوێنەوە لە دەم دێنە دەرەوە پێیان دەگوترێ بڕگە}.

ئەگەر تەماشای بڕگەکان بکەین لە وشەکانی سەرەوە، دەبینین کە هەر بڕگەیەك بەم شێوەیەی خوارەوە پێکهاتووە.

أ- هەندێك لەم بڕگانە لە دوو پیت پێکهاتووە، پیتی یەکەم نەبزوێنە، هی دووەم بزوێنە.

ب- هەندێك لەم بڕگانە لە سێ پیت پێکهاتووە، پیتی یەکەمو سێیەم نەبزوێنە، هی دووەم بزوێنە.

ج- بڕگە هەیە لەچوار پیت پێکهاتووە، پیتی یەکەمو سێیەمو چوارەم نەبزوێنە، هی دووەم بزوێنە.

## دەستوور:

**بڕگە: بریتییە لە چەند دەنگێك کە بە یەکجار لە دەم دێنە دەرەوە، لە پیتێکی نەبزوێن یا چەند پیتێکی نەبزوێن لەگەڵ پیتێکی بزوێن پێکدێت.**

### بڕگە دوو جۆرە:

1. **بڕگەی کورت: بریتییە لەو بڕگەیەی کە لەپیتێکی نەبزوێنو پیتێکی بزوێنی کورت پێکهاتووە.**
2. **بڕگەی درێژ: بریتییە لەو بڕگەیەی کە لەپیتێکی نەبزوێنو پیتێکی بزوێنی درێژ یا لە (دوو- سێ ) پیتی نەبزوێنو پیتێکی بزوێنی کورت یا بزوێنی درێژ پێك هاتووە.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم وشانەی خوارەوە بکە بە بڕگەو بزانە کە هەر وشەیەك لە چەند بڕگە پێکهاتووە. چەندیان بڕگەی کورتن‌و چەندیان بڕگەی درێژن.

(هاوینە هەوار، بابلیسك، گوڵزار، مرۆڤ، دڵ، پێشمەرگە، گۆڤەند، چاو پێکەوتن، مێهڤان).

## ڕاهێنانی (٢)

پێنج وشە بهێنەرەوە بە مەرجێك هەر یەکیان لە سێ بڕگە پێك هاتبێ‌و لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم دێرە هۆنراوانەی خوارەوە بڕگە- بڕگە بکەو بزانە هەر نیوە دێڕێك چەند بڕگەیە.

١. مەلی سەر پنچك پەل‌و پۆ ڕەنگین خۆ من هەڵۆنیـــــــم.
لێم مەفڕن جووت جووت مەترسن ئاخر پێتان بڵێم چیم

٢. سەوزە گیا پاراو گوڵ‌و گوڵاڵە مەستی ڕەنگ‌و بـــۆ
درەخت تازە شین سەر لق ڕازاوەی گوڵ، گەڵا، چرۆ

٣. ڕۆژا مێرو خورتا هەلات
هاتین د هەواراتە وەلات

٤. دوو زولفێن تە کتێبا حاجی قادر
زمانێ تە ژبەندا شێخێ خانـــــی.

٥. گوڵ چون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشـــــان
وە فراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان.

(وانەی پێنجەم)

# جیاوازی نێوان ڕستەو گرێ

-أ-

١. بازێڕی دهۆك.

٢. ئاوی کانی.

٣. بەفری شاخەکان.

٤. پێشمەرگەی بە جەرگ.

٥. خوینا شەهیدان.

٦. پەرلەمانی کوردستان.

-ب-

١. من لە بازێڕی دهۆك دەژیم.

٢. ئاوی کانی ساردە.

٣. بەفری شاخەکان لە بەهاراندا دەتوێتەوە.

٤. پێشمەرگەی بە جەرگ وەڵات دەپارێزێت.

٥. ئەم ئازادییە بەرهەمێ خوینا شەهیدانە.

٦. ئێمە لە پەرلەمانی کوردستاندا کار دەکەین.

## خستنه ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە دەستە پەیڤینی بەشی (أ) دەبینین دەستەواژەی (بازێری دهۆك) لە كۆمەڵە پەیڤێك پێك هاتییە كە پەیوەندییان بەسەر یەكەوە هەیە بەڵام ڕامانو مەبەستێكی تەواو نادەن بە دەستەوە چونكە. كارێكی لەگەڵدا نییە، لەبەر ئەمە پێی دبێژن (گرێ).

ئەگەر سەرنج بدەینە بەشی (ب) دەبینین پەیڤەكانی ژمارە (١) (من لە بازێری دهۆك دەژیم) لە كۆمەڵە پەیڤێك پێك هاتییە كە بەشێوەیەكی تایبەتی خروانەتە پالْ یەكترو واتاو مەبەستێكی تەواو دەبەخشن چونكە كاری (دەژیم)ی لەگەڵدایە، لەبەر ئەمە پێی دەگوترێت (ڕستە) هەروەها نموونەكانی تری بەشی (أ) هەموویان گرێنو نموونەكانی بەشی (ب) ڕستەن.

## دەستوور:

**گرێ: كۆمەڵە پەیڤێكە پەیوەندییان بەسەر یەكەوە هەیە بەڵام واتاو بیرێكی تەواو نادات بە دەستەوە چونكە كارێكی لەگەڵدا نییە. بەڵام (ڕستە) كۆمەڵە پەیڤێكە بەسەریەكەوە واتایەكی تەواو دەبەخشن چونكە كارێكی لە گەڵدایە.**

## ڕاهێنانی (١)

لەمانەی خوارەوە ڕستەو گرێ لەیەك جودا بكەوە:

١. باوكی ئازاد مامۆستایە.

٢. هەنگ شیلەی گوڵان دەمژێت.

٣. ئەوی شارەزا.

٤. هەڵگورد چیایەكی بەرزە.

٥. هاوینە هەواری سەرچنار.

٦. زەوی باش بەرهەمی باش دەدات.

## ڕاهێنانی (٢)

پێنج گرێ دروست بكەو لە ڕستەدا بەكاریان بهێنە:

## ڕاهێنانی (٣)

لەم پارچەیەی خوارەوەدا چەند ڕستەو گرێ هەیە دەریان بهێنە:

(( مرۆڤ، بۆ بە دەستەوە دانی پێویستییەكانی خۆی بۆ قسەكردنو لە یەك گەیشتن، زمانی داهێناوەو دروستی كردووە، وردە وردە لەگەڵ گۆڕانو گەشەكردنی ژیانی خۆیدا زمانیش گۆڕاوە )).

## ڕاهێنانی (٤)

لەم وشانە گرێ دروستبكەو پاشان بیانخە ڕستەوە:

(هەورامان، نێرگز، كتێبخانە، ئامێدی)

# جۆرەکانی ڕستە

## ڕستە بە پێی ناوەڕۆک

## (١)

## ڕستەی ڕاگەیاندن

**١. گۆی زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەسوڕێتەوە.**

**٢. ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت.**

**٣. ل چارێ چریا ئێکێ پەرلەمانێ کوردستانێ دامەزرا.**

**٤. برایێ کاوەی بە یەکەم دەرچوو.**

### خستنە ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ڕستێن لای سەرێ د بینین هەر ئێك ژوان واتاو ڕامانەکا تەواو دەبەخشێت، بەڵام ئەگەر لە ناوەڕۆکی (واتای) هەر ئێك ژوان ورد ببینەوە دێ بینین:

ڕستا ئێکێ و دووێ لە ڕاستییەکی نەگۆڕ دەدوێن.

ڕستا سێیێ لە کارەکێ تایبەتی دەدوێت.

ڕستا چارێ ل شتێکی دیارکراو دەدوێت.

بە مەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەو ڕستانەی کە ڕووداوێکی ڕاستی نەگۆڕ یان ڕووداوێکی دیار پیشان دەدەن، ڕستەی ڕاگەیاندنن.

## دەستوور:

ڕستە کۆمەڵە پەیڤێکە، کە بەشێوەیەکی تایبەتی ڕیز دەکرێن، هەموویان بەسەر یەکەوە واتایەکی تەواو دەبەخشن، لە کۆیشدا ڕستەکە تەواو بوو خاڵێك دادەنرێت. ئەنجا ئەگەر واتای ڕستەکە ڕووداوێکی دروستی نەگۆڕ یا ڕووداوێکی دیاری تێدا بەدی بکرێت و وەکو خەبەرێك ڕەنگە ڕاست بێت یان ڕاست نەبێت پێی دەگوترێت (ڕستەی ڕاگەیاندن).

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانەی خوارەوە چی پیشان دەدەن، بینووسە:

١. بە بازووی کرێکاران کارگەو پرۆژەی گەورە گەورە دادەمەزرێت.

٢. مرۆڤ هەندێك بەردو خۆڵی هەیڤی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ زەوی.

٣. پەیکەری شێری بابل نیشانەی هێزو دەسەڵاتی بابلییەکانە.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم وشانەی خوارەوە ڕستە دروست بکە:

١. نازاووزێ- دەکات- میکرۆب- زیاد- بە.

٢. رادیۆ- بگرە- لە- گوێ- تەنیشتمەوە- وەرە- دابنیشە- لە.

٣. هەڵبەستی- ئەحمەدی خانی- نەتەوایەتی- کوردە- سەرکێشی- ملەتی.

٤. بیرەوەرییا- کوردییە- ٢٢ی نیسانێ- ڕۆژنامەڤانییا.

## ڕاهێنانی (٣)

١. پەپوولەکە بەسەر گوڵەکەوە نیشتەوە.

پەپولەکە: ناوە، تاکە، بکەرە.

بە– وە : ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە.

سەر : هاوەڵکاری شوێنە.

گوڵەکە: ناوە، تاکە، تەواوکەری بەیاریدەیە.

نیشتەوە: کارە، ڕابردووە، تێنەپەڕە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

أ– گەڵای مێوەکە وشك بووە.

ب–دار بەڕوو ل کوردستانێ شیندبن.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| پەیڤ | | ڕامان |
| --- | --- | --- |
| دەتوێتەوە | : | دبۆڤرێت، دحەلییێت |
| بازوو | : | باسك |
| کارگە | : | کارگەهـ |
| پرۆژە | : | مشروع |
| پەیکەر | : | تمثال، |

## (٢)

# ڕستەی ڕاگەیاندن

## أ- ڕستەی ئەریٚ ب- ڕستەی نەریٚ

/١/

١. ئاوی ڕووبارەکە وشك بوو.

٢. نەسرینیٚ ئاگر هەلکر.

٣. کاوە کتێبی ڕێزمان دەخوێنێتەوە.

٤. ئەڤرۆ ئاڤدەل دیٚ چیتە زاخۆ.

٥. ماستیٚ هەولێریٚ ترشە.

/٢/

١. ئاوی ڕووبارەکە وشك نەبوو.

٢. نەسرینیٚ ئاگر هەلنەکر.

٣. کاوە کتێبی ڕێزمان ناخوێنێتەوە.

٤. ئەڤرۆ ئاڤدەل ناچیتە زاخۆ.

٥. ماستیٚ هەولێریٚ ترش نینە (ترش نییە).

## خستنەڕوو:

١. ئەگەر سەرنج بدەینە کۆمەڵە ڕستەکانی بەشی یەکەم، دیٚ بینین هەموویان خەبەر لە ڕوودانی شتێك دەدەن.

ڕستەی یەکەم بەیانی وشك بوونی ئاو دەکات لە ڕووبارەکەدا.

ڕستەی دووەم بەیانی هەلکرنا ئاگری ژلایێ نەسرینێ ڤەدکەت.

ڕستەی سێیەم بەیانی خوێندنەوەی کتێبی ڕێزمان دەکات لەلایەن کاوەوە.

ڕستەی چوارەم بەیانی چوونی ئاڤدەل دەکات بۆ زاخۆ.

ڕستەی پێنجەم بەیانی ترش بوونی ماست دەکات.

٢. ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی دووەم دەبینین هەموویان خەبەر لە ڕوونەدانی شتێك دەدەن بە پێچەوانەی ڕستەکانی بەشی یەکەمەوە:

ڕستەی یەکەم نەرێ ئەوە دەکات کە ئاوی ڕووبارەکە وشك بووبێت.

ڕستەی دووەم نەرێ ئەوە دەکات کە ئاگر هاتبیتە هەلکرن.

ڕستەی سێیەم نەرێ ئەوە دەکات کە کتێبی ڕێزمان لەلایەن کاوەوە بهێتە خواندن.

ڕستەی چوارەم نەرێ ئەوە دەکات کە ئاڤدەل بچێت بۆ زاخۆ.

٣. ئەگەر دووبارە بە وردی کۆمەڵە ڕستەکانی بەشی یەکەمو بەشی دووەم بخوێنینەوەو جوداهی نێوانیان هەلّ بسەنگێنین دەبینین:

أ- لە ڕستەکانی بەشی دووەمدا هاوەلکاری نەرێ هەیەو، خراوەتە پێش کاری ناو ڕستەکە، کە ئەمە لە ڕستەکانی بەشی یەکەمدا نییەو بەرچاو ناکەوێت، ئەم هاوەڵکارە نەرێیەش لە ڕستەی یەکەمو دووەمی بەشی ڕستەکانی ریزی دووەمدا (نە)یەو لە ڕستەی سێیەمو چوارەمدا هاوەڵکاری (نا)یە.

لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵکاری نەرێ (نین- نی)یە لەپێش کاری ناتەواو (ە) هاتووە.

ب- ئەنجا ئەو ڕستانەی کە کەوتوونە بەشی یەکەمەوەو هاوەڵکاری (نەرێ) یان تێدا نییەو خەبەر لە ڕوودانی شتێك دەدەن پێیان دەگوترێت (ڕستەی ئەرێ) بەڵام ئەو ڕستانەی کە کەوتوونە بەشی دووەمەوەو هاوەڵکاری (نە)و (نا) و (نین- نی)ی نەرێیان لە پێش کارەکەوە تێدا بەدی دەکرێتو خەبەر لە ڕوونەدانی شتێك دەدەن دبێژنێ (ڕستەی نەرێ).

## دەستوور:

**ڕستەی ڕاگەیاندن دوو جۆرە:**

١. **ڕستەی ئەرێ: ئەو ڕستەیەیە کە ڕوودانی شتێك پیشان دەدات.**

٢. **ڕستەی نەرێ: ئەو ڕستەیەیە کە ڕوونەدانی شتێك پیشان دەدات، بە بۆنەی هاوەڵکاری (نە) و (نا)ی نەرێیەوە. کە دەخرێنە پێش کاری ناو ڕستەکەوە.**

٣. **کاری ناتەواوی کاتی ئێستا (ە) بە (نی- نین) نەرێ دەکرێت.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانەی خوارەوە (نە) یا (نا) یا (نی– نین) یان بۆ دابنێ:

١. ژوورەکە ڕووناکە.

٢. کاکم دەچێت بۆ هەولێر.

٣. دوێنێ هەینی بوو.

٤. ئەم ماستەی، کە تۆ کڕیوتە، ترشە.

٥. کەلا ئامێدی بلندە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە (نە، نا، نی، نین) پڕ بکەوە:

١. قەدری مانگ......... گیرێت، تا ......... گاتە شەو.

٢. سوار تا ......... گلێ ......... بێت بە سوار.

٣. دووربینی پەشیمانی لە شوێن .........یە.

٤. ئاگام لە کەس ......... یە.

٥. سەرێ ......... ئێشیت پێتڤی دەرسۆکێ .........

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستە نەرێیانە بکە بە ڕستەی ئەرێ:

١. ئازاد لەماڵەوە نییە.

٢. ئەز ل گەل وی نەبووم.

٣. ئەمە ڕێگای کەرکووك نییە.

٤. دوێنێ لێرە باران نەباری.

٥. دلێر فراڤینێ ناخۆت.

٦. تۆ ئەم دەرسە باش نازانیت.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم هاوەڵکارانە (نە، نا، نی، نین) لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

## ڕاهێنانی (٥)

### شلۆڤەکردن

١. دوێنێ باران نەباری.

دوێنێ: هاوەڵکاری کاتە

باران: ناوە، تاکە، بکەرە.

نە: هاوەڵکاری نەرێیە.

باری: کاری ڕابوردووە تێنەپەرە

٢-ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

أ- ئازاد نەگەیشتۆتە کەرکووك.

ب- شنۆ لە خوێندن دوا ناکەوێت.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| پەیڤ | | ڕامان |
|---|---|---|
| دامەزراوە | : | دەینادیە |
| دواکەوتن | : | پاشکەڤتن |
| بەش | : | پشك |
| دوێنێ | : | دوهی |
| دەرسۆك | : | سەرپۆش، دەسرۆك |

# ڕستەی پرس

**١. سیروان گەیشتە جیّ؟**

**بەڵیّ. واتە، سیروان گەیشتە جیّ.**

**نەء (نەخێر). ئانکۆ، سیروان نەگەیشتە جیّ.**

**٢. ئەریّ (ئایا) تەکەو دڤێت یان پۆڕ؟**

**کەو. ئانکۆ، من کەو دڤێت.**

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو دوو ڕستەیەی سەرەوە دەبینین:

١. لە ڕستەی یەکەمدا پرسکەر لە شتێك دەپرسێت کە نایزانێتو لەلای ڕوون نییەو داخازی، ژ گوهداری دکەت تیّ بگەهێنیت، بۆ ئەم مەبەستە بە ئاوازێکی تایبەتی ڕستەکە دەردەبڕێت، و لە نووسینیشدا نیشانەی پرس (؟) دەخرێتە کۆتایی ئەم جۆرە ڕستانە.

بەرسڤدان ژی (وەلامدانەوە) ب دوو شێوە دەبێت:

أ- ئەگەر گوێگر (بەرسڤدەر) ویستی لە پرسکەر بگەهینیت، کە کارەکە ڕوویداوە، یا هاوەڵکاری ئەریّ (بەلّیّ) بەکاردەهێنێت، یا وەلامەکە هەمووی بە تەواوی بەشێوەی ئەریّ بلّێتو بێژێت (سیروان نەگەیشتە جیّ).

ب- ئەگەر گوێگر (وەڵامدەرەوە) ویستی لە پرسکەر بگەیەنێت، کە کارەکە ڕووی نەداوە بۆی هەیە، یا هاوەڵکاری نەرێ (نە) یا (نەخێر) بەکار بهێنێت، یا بەرسڤەکە بەشێوەی ڕستەی نەرێ بڵێتەوە (سیروان نەگەیشتە جێ).

٢. لە ڕستەی دووەمدا پرسکەر، پرس لە گوێگرەکەی دەکات، کە لەو دوو شتە کامیانی دەوێتو هەڵبژاردنی داوەتە دەست گوێگر، بۆ ئەمە هاتووە پەیڤا پرسێ (ئایا- ئەرێ)و نیشانەی پرس (؟)ی بەکارهێناوە، بەرسڤدانی گوێگر لەم ڕستەیەدا بەدەست نیشانکردنی یەکێك لەو دوو شتە دەبێت کە لەلای ڕوون نین، ئەنجا لەم ڕستەیەدا لەبەر ئەوەی (کەوەکە) مەبەست بووە، لە وەڵامدا ئەو دەست نیشان کراوە، ئەو پەیڤانەی کە بۆ پرسیار بەکاردەهێنرێن جگە لە (ئایا- ئەرێ) ئەمانەن:

١. کێ (کی): پرسیاری پێ لە کەسێك دەکرێت، وەك:

کێ کتێبەکەی خوێندەوە؟

کێ هات؟

٢. چی (چ): پرسیاری پێ لە شتێك دکرێت، وەك:

ماسی بە چی ڕاو دەکرێت؟

دێ چ خۆی؟

٣. کوێ (کیڤە): پرسیاری پێ لە شوێنێك دەکرێت، وەك لە کوێ بوویت؟

تۆ لکیڤە بووی؟

٤. کەی (کەنگی): پرسیاری پێ لە کاتێك دەکرێت، وەك:

کەی جووتیار تۆوی گەنم دەچێنێت؟

کەنگی دێ خوینی؟

٥. چۆن (چاوان) پرسیاری پێ لە چۆنێتی (چەوانیا) دەکرێت، وەك:

نەوت چۆن دەردەهێنرێت؟

پەپمان چاوان (چاوا) چیرۆکێ دەنڤیسیت؟

٦. چەند (چقاس): پرسیاری پێ لە ژمارەو ئەندازەیەك دەکرێت، وەك زەوی بە چەند ڕۆژ بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە؟

ڕزگار ب چەند وانان کەفتییە؟

تە چقاس پارە هەیە؟

٧. کام– کامە (کیژ– کیژك): پرسیاری پێ لە دەست نیشانکردنی شتێك دەکرێت لەناو چەند شتێکدا، وەك:

لەم گوڵانە کامیانت دەوێت؟

کیژ قوتابی ژ هەمیا زیرەکترە؟

ژڤان ڕەنگان تە کیشك دڤێت؟

وەڵامی ئەم پەیڤانەی کە بۆ پرس بەکاردەهێنرێن هەموویان بە دەست نیشانکردنی ئەو شتە دەبێت، کە پرسراوە، بۆ وێنە ئەگەر یەکێك بپرسێت:

(کەی دەچیت بۆ لادێ؟) لە وەڵامدا ئەو کاتە دەست نیشان دەکرێت کە چوونەکەی تێدا ڕوودەدات، ئەگەر (هەفتەی داهاتوو) بوو، وەڵام بەم جۆرە دەبێت: (هەفتەی داهاتوو دەچم بۆ لادێ)

## دەستوور:

**پرسیار بەم شێوانە دەکرێت:**

**١. یا بە هۆی ئاوازێکی تایبەتییەوە کە ڕستەکەی پێ دەردەبڕێتو لە نووسینیشدا نیشانەی پرس (؟) دادەنرێت.**

**٢. یا بەهۆی بەکارهێنانی پەیڤا پرسێ (ئایا- ئەرێ)و نیشانەی پرس (؟) لەو ڕستانەدا کە پرسیاریان پێ لە ناوەڕۆکی ڕستەکە دەکرێت. وەڵام ژی بە هاوەڵکاری (بەڵێ) لە باری ئەرێداو هاوەڵکاری (نە) و (نەخێر) لە باری نەرێدا دەبێت.**

**٣. بەهۆی وشەی پرس (ئایا- ئەرێ)و (کام- کیژ)و دانانی نیشانەی پرس (؟) لەو ڕستانەدا پرسیاریان پێ لە دەست نیشانکردنی شتێك لەناو دوو شت یا پتردا دەکرێت بەرسڤ ژی بەدەست نیشانکردنی شتە پرسراوەکە دەبێت.**

**٤. پەیڤەکانی پرس، وەڵامیان بە دەست نیشانکردنی مەبەستەکە دەبێت.**

**٥. لە کۆتایی ڕستەی پرسدا، نیشانەی پرس (؟) دادەنرێت بۆ ئەوەی ژ ڕستا ڕاگەهاندنێ بهێتە جودا کرن.**

**٦. لە ڕستەی پرسدا پرسکەر چاوەڕێی بەرسڤ لە گوێگرەکە دەکات.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە پەیڤێکی پرس پڕ بکەوە:

١. زمانی تۆ ......... یە؟

٢. گەنم ......... دهێتە چاندن؟

٣. کاروان لەگەلێ ......... چوو بۆ سەیران؟

٤. ......... ل کوردستانێ بەفر دبارێت؟

٥. ......... تۆ وانا خۆ نا نڤیسی؟

٦. ......... نەخوێندەواری ل کوردستان دا نامێنێت؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانەی هێڵیان بە ژێردا هاتووە پەیڤی پرسیاریان لە جێ دابنێ ڕستەکانیش بخە شێوەی پرسەوە:

١. دار گوێز لە کوردستاندا دەڕوێت.

٢. ئارمسترۆنگ یەکەم کەس بوو گەیشتە سەر مانگ.

٣. ئەز ب کەلەکێ ژ ڕووباری دەرباز بووم.

٤. گرانی یا باری ٢٠ کیلۆیە.

٥. ئەمەیان باشترە.

٦. ناڤێ من هشیارە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم پەیڤانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

کام – ئایا – چۆن – چما– چی – کەنگی– کویٚ– چەند– چاوان.

## ڕاهێنانی (٤)

### شلۆڤەکردن

١. بەفر لە کویٚ دەبارێت؟

بەفر: ناوە، تاکە، بکەرە.

لە: ئامرازی پەیوەندییە.

کویٚ: پەیڤی پرسە.

دەبارێت: کاری ڕانەبردووە، تێنەپەڕە.

ێت: جێناوی لکاوە، شوێنی (بەفر)ی گرتووە، کە بکەرە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

أ– جووتیار زەوی بەچی دەکێلێت؟

ب– شڤان چاوان وانیٚ دخوینیت؟

### ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| پەیڤ | | ڕامان |
|---|---|---|
| کۆتایی | : | دویماهی |
| وەڵام | : | بەرسڤ |
| گوێگر | : | گوهدار |
| قورس | : | گران |
| لادیٚ | : | گوند |

## (٤)
# ڕستەی سەرسوڕمان

/١/

کەریم خانی زەند چ پێشەوایەکی دادخوازبوو!

کوردستان چەند خۆشە!

کام ڕێگا، هیوای سەرکەوتنی تێدا بووبێت، گرتوومەبەر!

کیژ دەلیقە هەلکەفتییە، من مفاژێ وەرنەگرت!

/٢/

ئای! ئەوە لێرە دانیشتوون.

ئاخ! نەسەرمان ما، نە ماڵ.

ئۆف! سەرێ من چەند دئێشێت!

مخابن! بۆڤی لاوی.

ئافەرین! بە یەکەم دەرچوویت.

ئۆخەی! لە دەست دەرەبەگ ڕزگارمان بوو.

## خستنه ڕوو:

١. ئەگەر بڕوانینە ڕستەکانی ڕیزی یەکەم دەبینین، هەموویان ڕستەی پرسن‌و هەستێکی تایبەتیان تێدایە، بەڵام چونکە لە پرسەکانیاندا پێویستیان بە وەڵام نییە، ئانکۆ چاوەڕێی دەستنیشانکردنی مەبەست لە گوێگر ناگرێت‌و لە جیاتی نیشانەی پرس (؟) لە نووسیندا نیشانەی سەرسوڕمان (!) لە کۆتایی ڕستەدا دادەنرێت، پێی دەگوترێت (ڕستەی سەرسوڕمان).

٢. ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی ڕیزی دووەم دەبینین، هەر یەکەیان وشەیەکی تێدایە، بەهۆی ئەو پەیڤەوە هەستێکی تایبەتی (خۆشی، ناخۆشی، سەرسووڕمان) لە ڕستەدا بەدی دەکرێت.

أ- لە ڕستەی یەکەمدا بە بۆنەی وشەی (ئای)ەوە هەستی مەندە هۆشی بەدی دەکرێت.

ب- لە ڕستەی دووەم‌و سێیەم‌و چوارەمدا بە بۆنەی پەیڤەکانی (ئاخ، ئۆف، مخابن)ەوە هەستی ناخۆشی دهێتە دیارکرن.

ج- لە ڕستەی پێنجەم‌و شەشەمدا بەهۆی وشەکانی (ئافەرین، ئۆخەی) هەستی خۆشی بەدی دەکرێت.

## دەستوور:

**ڕستەی سەرسوڕمان ئەو ڕستەیەیە هەستێك یا سۆزێکی تێدایە یا بە یاریدەی پەیڤی (پرس) یا پەیڤی (سەرسوڕمان)ەوە پێك دێت‌و بە ئاوازێکی تایبەتییەوە دهێتە دەربڕین. لە ڕستەی سەرسووڕماندا پرسکەر**

**چاوەڕێی بەرسڤ ناکات، لە جیاتی نیشانەی پرس (؟) نیشانەی سەرسووڕمان (!) دادەنرێت لە نووسیندا.**

**زۆربەی پەیڤەکانی سەرسووڕمان ئەوانەی کەلەزمانی کوردیدا بەکاردەهێن ئەمانەن:**

**(ئای، ئاخ، ئۆف، مخابن، ئافەرین، بژی، ئۆخەی... هتد).**

## ڕاهێنانی (١)

ڕستەی سەرسوڕمان لەمانەی خوارەوە درووست بکە:

گوڵێکی جوان- قارەمانێك- بەڵایەکی نالەبار- نەمانی زۆرداری- سەرکەفتنا پێشمەرگەیەکی.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە بە پەیڤێکی سەرسوڕمان پڕ بکەوە:

١. .......... ! لە داخی منداڵی بزێڤ.

٢. .......... ! ئەوە تەواوت کرد.

٣. .......... ! ل گەڵ مەنە هات.

٤. .......... ! ڤێرە چەند جهەکێ خۆشە !

٥. .......... ! چەند ماندوو بووم !

٦. .......... ! چ پیاوێك بوو !

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

ئۆخەی !، بژی !، ئای !، ئافەرین !، ئۆف !، ئۆخەش !.

## ڕاهێنانی (٤)

### شلۆڤەکردن

١. ئای! کاوە کەوت بەدەمدا.

ئای: وشەی سەرسوڕمانە.

کاوە: ناوە، تاکە، تایبەتییە، سادەیە، بکەرە.

کەوت: کاری ڕابوردووە، تێنەپەڕە.

بە–دا: ئامرازی پەیوەندییە.

دەم: ناوە، تاکە، سادەیە، گشتییە، بەرجەستەیە، تەواوکەری بە یاریدەی کاری (کەوت)ە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

أ– سێوی ئەم باخە چەند جوانە!

ب– ئۆخەی! بە یەکەم دەرچوویت.

### ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| پەیڤ | | ڕامان |
|---|---|---|
| دادخواز | : | عادل |
| هیوا | : | هیڤی |
| بەدی | : | دیار |
| بزیڤ | : | شیم، چەقاوەسوو |
| سەرسوڕمان | : | مەندەهۆشی |

# بنچینەکانی ڕستە

## أ- (بکەر- کار)

## ب- (نیهاد- گوزارە)

/أ/

١. دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە.

٢. فەرهاد دانیشت.

٣. ڕەزڤانی زەڤی ئاڤدا.

٤. باران باری.

٥. کەوەکە دەفڕێت.

٦. دارای سێڤ خار.

/ب/

١. دایکا وان دڵسۆز بوو.

٢. سەردار تۆلازەکێ ڕەوشنبیرە.

٣. تۆوەکە شین دەبێت.

٤. فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەی هەژار بەسوودە.

٥. قوتابییەکە دەبێت بە پزیشك.

٦. زڤستان سارە.

## خستنه ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (أ) دەبینین هەر ڕستەیەك لە دوو بەش پێکهاتووە، ئەگەر یەکێکیان لاببەین شیرازەی ڕستەکە تێکدەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین. بۆ نموونە: لە ڕستەی (دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە) ئەگەر بێتو وشەی (دچیت) لاببەین. ئەوی تریان بە تەنیا ناتوانێت ماناو نیازو مەبەستی ڕستەکە بدات بە دەستەوە، هەروەها ڕستەکانی تریش، بە مەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو ڕستەیەك لەسەر دوو بنچینە دادمەزرێت، ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی تەواوبوو، بنچینەی ڕستەکە بەم شێوەیە دەبێت. یەکێکیان (بکەر)ەو ئەوی تریان (کار)ە. وەکو لەمەولا ڕوونی دەکەینەوە.

١. لە ڕستەی (دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە) وشەی دلۆڤان ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دچیت (کار)ە چونکە کردەوەیەکی نیشان داوە کە دلۆڤان کردوویەتی.

٢. لە ڕستەی (فەرهاد دانیشت). وشەی فەرهاد ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دانیشت (کار)ە چونکە کردەوەیەکی نیشان داوە کە فەرهاد کردوویەتی.

٣. لە ڕستەی (ڕەزڤان زەڤی ئاڤدا). وشەی ڕەزڤان ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی ئاڤدا (کار)ە چونکە کارێکی نیشان داوە کە ڕەزڤان کردوویەتی.

٤. لە ڕستەی (باران باری). وشەی باران ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی دراوەتە پاڵ، وشەی باری (کار)ە چونکە کارێکی نیشان داوە کە دراوەتە پاڵ باران.

٥. لە ڕستەی (کەوەکە دەفڕێت). وشەی کەوەکە ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دەفڕێت (کار)ە چونکە کارێکی نیشان داوە کە کەوەکە کردوویەتی.

٦. لە ڕستەی (دارای سێڤ خار)، وشەی دارا ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە.

وشەی خار (خوارد) (کار)ە چونکە کارێکی نیشان داوە کە دارا کردوویەتی:

کەوابوو: لە ڕستەی کاری تەواو، ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت بنچینەی یەکەم (بکەر)ەو بنچینەی دووەم (کار)ە.

هەروەها ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین کە هەر ڕستەیەك لە دوو بەش پێك هاتووە. یەکێکیان لا ببەین شێرازەی ڕستەکە تێك دەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین، هەموو ڕستەیەك لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت. ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی ناتەواو بوو بنچینەکانی، یەکێکیان نیهادەو ئەوی تریان گوزارەیە وەکو لەم ڕستانەدا دەردەکەوێت.

١. لە ڕستەی (دایکا وان دڵسۆز بوو) وشەی (دایك) ناوە، نیهادە چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (بوو) کاری ناتەواوە، بە

یاریدەی وشەی دڵسۆز بووە بە گوزارەو سیفەتێکی داوەتە پاڵ دایك.

٢. لە ڕستەی (سەردار تۆلازەکێ ڕەوشەنبیرە). وشەی سەردار ناوە، نیهادە چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی ڕەوشنبیر بووە بە گوزارەوە سیفەتێکی داوەتە پاڵ سەردار.

٣. لە ڕستەی (تۆوەکە شین دەبێت). وشەی تۆوەکە ناوە، نیهادە چونکە خەبەرێکی دراوەتە پاڵ, وشەی دەبێت کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی (شین) بووە بە گوزارەو خەبەرێکی داوەتە پاڵ تۆوەکە.

٤. لە ڕستەی (فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەی هەژار بە سوودە). وشەی فەرهەنگ ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی بە سوود بووە بە گوزارە سیفەتێکی داوەتە پاڵ فەرهەنگ.

٥. لە ڕستەی (قوتابییەکە دەبێت بە پزیشك). وشەی قوتابییەکە ناوە، نیهادە، چونکە خەبەرێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (دەبێت) کاری ناتەواوە، بە یاریدەی وشەی پزیشك بووە بە گوزارەو خەبەرێکی داوەتە پاڵ قوتابییەکە.

٦. لە ڕستەی (زفستان سارە). وشەی زفستان ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یارمەتی وشەی (سار) بووە بە گوزارەو سیفەتێکی داوەتە پاڵ زفستان.

کەوابوو: لە ڕستەی کاری ناتەواو دا بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (نیهاد، گوزارە).

## دەستوور:

**ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت ئەگەر یەکێکیان لابرێت ڕستە تێك دەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین.**

**أ- ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی تەواو بوو، بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (بکەر، کار).**

**ب- ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی ناتەواو بوو، بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (نیهاد، گوزارە).**

**بکەر: ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە لەڕستەدا کارێکی کردووەو یان کارێك دەکات، یا کارێکی دەدرێتە پاڵ.**

**کار: ئەوەیە کە کردەوەیەك نیشان دەداتو دەدرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك.**

**نیهاد: ئەو ناوەیە یا ئەو جێناوەیە کە لەڕستەدا خەبەرێك یا سیفەتێکی دەدرێتە پاڵ بەڵام بە هیچ کارێك هەڵناستێ.**

**گوزارە: بریتییە لە کاری ناتەواو بە یارمەتیی وشەیەکی تر خەبەرێك یا سیفەتێك دەداتە پاڵ نیهادەوە.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا بنچینەکانی ڕستە دیاربخەو جۆرەکەی نیشان بدە:

١. نێرگز کولیکەکا سپییە.

٢. باخەوان گوڵ دەچێنێت.

٣. کۆچەرێن جافان دچنە زۆزانان. (جاف= عەشیرەتێکی کوردە)

٤. ئاوەکە دەبێت بە سەهۆڵ.

٥. هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت.

٦. ڕاستی سەر دەکەوێت.

## ڕاهێنانی (٢)

پێنج ڕستە بهێنەوە بە مەرجێك بنچینەی سێیانیان (بکەرو کار) بێتو بنچینەی دووانیان (نیهادو گوزارە)بێت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کارانە بخە بۆشاییەکانی خوارەوە:

(پشکوت، بەزاند، درێژکرد، ڕاگەیاند، دەست پێکرد، گرتەوە، هاتن)

گەلی کوردستان شێرانە ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری (١٩٩١)ز ........ هێزی شەڕی بە ........ مژدەی سەرکەوتنی ........ غونچەی ئازادی کە خوێنی شەهیدان ئاودرابوو دەمی ........ کامەرانی باڵی خۆیو هەموو لایەکی ........ پەرلەمانو حوکومەتی کوردستان ........ کایەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە (شلۆڤە بکەڤە):

١. شەرمین دەچێت بۆ قوتابخانە.

٢. باخەوان سێوەکەی فرۆشت.

٣. بەهاری کوردستان ڕەنگینە.

# کار

## أ- کاری تەواو

١. کاوەی ئاسنگەر شۆڕشی لە دژی زۆرداری بەرپاکرد.

٢. دایکی شەهید فرمێسکی خوێنین دەڕێژێت.

٣. کورد بە ئازادی ئەندامی پەرلەمانی هەڵبژارد.

٤. شرینیٚ پەز دۆشی.

٥. ئێوەی تێکۆشەر سەر دەکەون.

٦. ئاراسی ماسی دناڤ گۆمێدا گرت.

## ب- کاری ناتەواو

١. دراوی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشە.

٢. ئاگر نیشانەی جەژنی نەورۆزە.

٣. گوڵە سپییەکە جوان بوو.

٤. ئاوی گۆزەکە سارد بوو.

٥. چیمەنەکە سەوز دەبێت.

٦. هەر دەوەنە دەبێت بە دار.

## خستنە ڕوو:

لەوانەی پێشوودا خوێندمان کە ڕستە لەسەر دوو بنچینە پێکدێت ئەویش بنچینەی ڕستەیە، کە (بکەرو کار)ە، ئەگەر سەیری ڕستەکانی

سەرەوە بکەین، دەبینین هەموویان لەسەر ئەو دوو بنچینەیە پێکهاتوونو هەر یەکەشیان، واتاو مەبەستی تەواو دەدات بە دەستەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (أ) دەبینین (بەرپاکرد، دەرێژێت، هەڵبژارد، دۆشی، سەردەکەون، گرت) هەموویان کارنو هەر یەکەیان کردەوەیەکیان نیشانداوە یان نیشانی دەداتو دراوەتە پاڵ کەسێك، کە (بکەر)ەکەیەتی، هەروەها هەر یەکەیان بە تەنیا مانای تەواوو سەربەخۆیان هەیە، بۆیە بەو کارانە دەگوترێت کاری تەواو و (نەلکاون بە وشەی ترەوە).

جا ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب)، دەبینین (ە) لە ڕستەی یەکەمو دووەمدا (بوو) لە ڕستەی سێیەمو چوارەمداو (دەبێت) لە ڕستەی پێنجەمو شەشەمدا، هەر یەکەیان ڕوودانێکیان نیشانداوە یان نیشانی دەدەن، بەڵام هەر کارێك لەم کارانە بە تەنیا واتای تەواو نابەخشێت، بەڵکو پێویستی بە یارمەتی وشەیەکی تر هەیە بۆ ئەوەی واتاکەی تەواو واتادار بێت یان بڵێین وەکو کار ئەرکی خۆی ببینێت، بۆیە بەو کارانە دەگوترێت کاری ناتەواو.

## دەستوور:

**ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت، بنچینەی یەکەم: بکەرەو بنچینەی دووەم: کارە، کاریش دوو جۆرە:**

أ- کاری تەواو: ئەو کارەیە کە بەبێ یاریدە، کردەوەیەك نیشان دەدات‌و دراوەتە پاڵ کەسێك یا شتێك کە (بکەرە)کەیەتی‌و مانای تەواو سەربەخۆی هەیە، پێویستی بە وشەیەکی دیکە نییە...

ب- کاری ناتەواو: ئەو کارەیە کە کردەوەیەك نیشان دەدات بەڵام بە یاریدەی وشەی دی دەتوانێت هەواڵێك یان سیفەتێك بداتە پاڵ بکەرەکەی[1] .

کاری ناتەواویش لە سێ شێوەو تافدا خۆی دەنوێنێت:

١. (ە): بۆ دەمی ڕانەبوردووی (ئێستا).

٢. (بوو): بۆ دەمی ڕابوردوو.

٣. (دەبێت): بۆ دەمی ڕانەبوردوو (ئایندە).

(سەرچاوە/ زمان‌و ئەدەبی کوردی

پۆلی یەکەمی ناوەندی- سلێمانی)

---

(١) ئەم هەواڵە یان سیفەتە دەدرێتە پاڵ (نیهاد) .

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا (کاری تەواو- کاری ناتەواو) دەربهێنە:

١. دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

٢. کوردستان بە قوربانیدانی ڕۆڵەکانی ڕزگار دەبێت.

٣. درۆزن دوژمنی خوایە.

٤. ماڵی ئێوە خۆشبوو.

٥. ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ دەیگوت ترشە.

٦. چەم بێ چەقەڵ نابێت.

٧. دەوڵەمەندی بە دڵە بە ماڵ نییە، گەورەیی بە عەقڵە بە ساڵ نییە.

## ڕاهێنانی (٢)

(کراسە سپییەکە پیسە)

١. کاری ڕستەکە دەربهێنە، چ جۆرێکە؟ لە چ دەمێکدایە؟

٢. کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ دەمی ڕابوردوو پاشان ڕستەکە بنووسەوە.

٣. کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ دەمی ڕانەبوردوو (ئایندە) پاشان ڕستەکە بنووسەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەمانەی خوارەوەدا، کاری تەواو و ناتەواو جیا بکەرەوە، لەدواییدا بیانخەرە ڕستەوە.

(دەوەرێت، سارد بوو، گریا، دەبێت، ە، فیشکاندی)

## ڕاهێنانی (٤)

شیکردنەوە:

١. منداڵەکە پێدەکەنێت.

منداڵەکە: ناوە، گشتییە، بکەرە.

پێدەکەنێت: کاری تەواوە رانەبردووە.

ێت: جێناوی کەسی لکاوە، بۆ کەسی سێیەمی تاك، دەگەڕێتەوە بۆ بکەر.

٢. تۆش ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەرەوە:

١. ترێ پێگەیشت.

٢. سێوەکە مزربوو.

### لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| پەز | : | مێگەل، مەڕو بزن |
| دناڤ گۆمێدا | : | لەناو کۆماوەکەدا |
| نەدەگەیشت | : | نەدگەهشتێ |
| چەقەڵ | : | تویری |
| گەورەیی | : | مەزناتی |
| پێگەیشت | : | پێگەهی |

# (دیارخەری ناو- تەواوکەری کار)

١. دایکی شەهید فرمێسکی خوێنین دەڕێژێت.

٢.برادەری ئازاد بە یەکەم دەرچوو.

٣.هەڤاڵێ من ب لەز هات[1] .

٤.قوتابیی زیرەك هۆنراوەکان لەبەر دەکات.

٥.مرۆڤێت باش لە تەنگافیادا دەردکەڤن.

٦.مامۆستای ئێوە کتێبەکان دابەش دەکات.

٧.وڵاتەکەمان بە زانست پێش دەکەوێت.

٨.برایێ تە چیرۆك نڤیسییە.

٩. مە کتێب ژوی وەرگرت.

١٠. دەشتا هەڤلێرێ ب پیتە.

## خستنە ڕوو:

پێشتر ئەوەمان زانی کە ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت. (بکەر، کار) یا (نیهاد، کاری ناتەواو) ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین، دەبینین:

---

(١) ب لەز هات= خێراهات، بە پەلە هات.

١. پەیڤ[1] یان وشەی (دایك، برادەر، هەڤاڵ، قوتابی، مرۆڤ، مامۆستا، وڵات، برا، مە). هەر یەکیان لەو شوێنەدا دەوری بکەریان بینیوە، وشەی دەشت دەوری نیهادی بینیوە.

٢. پەیڤی (دەڕێژێت، دەرچوو، هات، لەبەر دەکات، دەردکەڤن، دابەش دەکات، پێش دەکەوێت، نڤیسییە ، وەرگرت، ە). هەموویان (کار)ن.

٣. لەم ڕستانەدا بێجگە لە بنچینەکانی ڕستە هەندێك وشەی دیکە دەبینرێت ئەمانە تەواوکەرن بۆ تەواوکردنو زیادە واتای دیکە هێنراونەتە ناو ڕستەکانەوە.

١- لە ڕستەی (دایکی شەهید فرمێسکی خوێنین دەڕێژێت). وشەی شەهید ناوە، دیارخەری ناوی (دایك)ە، چونکە واتای وشەی دایکی تەواوکردووە کە (بکەر)ە، پەیڤی (فرمێسك) ناوە دیارخەری کاری (دەڕێژێت)ە. واتە بەرکارە. چونکە واتای کارەکەی تەواو کردووەو کاریگەرییەتی کارەگەشی کەوتۆتە سەر. وشەی خوێنین ئاوەڵناوە دیارخەری ناوی فرمێسکە، چونکە واتای وشەی فرمێسکی تەواو کردووە.

٢- لە ڕستەی (برادەری ئازاد بە یەکەم دەرچوو).

وشەی ئازاد ناوە دیارخەری ناوی برادەرە چونکە واتای وشەی برادەری تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی بە یەکەم هاوەڵکارە

---

(١) پەیڤ = وشە.

تەواوکەری کاری (دەرچوو)یە چونکە واتای کارەکەی زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

٣- لە ڕستەی (هەڤالێ من ب لەز هات)

وشەی (من) جێناوە، دیارخەری ناوی (هەڤال)ە چونکە واتای وشەی هەڤالێ تەواوکردووە کە (بکەر)ە، وشەی بلەز هاوەڵکارە تەواوکەری کاری (هات)ە چونکە واتای کارەکەی زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

٤- لە ڕستەی (قوتابیی زیرەك هۆنراوەکانی لەبەر دەکات).

پەیڤی (زیرەك) هاوەڵناوە، دیارخەری ناوی قوتابییە، چونکە واتای وشەی قوتابی تەواو کردووە کە (بکەر)ە وشەی هۆنراوەکان ناوە تەواوکەری کاری (لەبەر دەکات)ە، واتە بەرکارە، چونکە واتای کاری (لەبەر دەکات)ی تەواو کردووەو کاریگەرییەتی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٥- لە ڕستەی (مرۆڤێت باش ل تەنگاڤیادا دەردکەڤن).

وشەی باش هاوەڵناوە دیارخەری ناوی (مرۆڤ)ە، چونکە واتای وشەی (مرۆڤ)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی ل تەنگاڤیادا هاوەڵکارە تەواوکەری کاری (دەردکەڤن)ە، چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووە.

٦- لە ڕستەی (مامۆستای ئێوە کتێبەکان دابەش دەکات)

وشەی ئێوە جێناوە دیارخەری ناوی مامۆستایە، چونکە واتای وشەی مامۆستای تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی کتێبەکان ناوە،

تەواوکەری کاری (دابەش دەکات)ە. واتە بەرکارە، چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەرییەتی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٧- لە ڕستەی (وڵاتەکەمان بە زانست پێش دەکەوێت).

وشەی (مان) جێناوە، دیارخەری ناوی (وڵات)ە چونکە واتای وشەی (وڵات)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی زانست ناوە تەواوکەری بە یاریدەی کاری (پێش دەکەوێت)ە چونکە واتای کارەکەی بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی (بە) زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

٨- لە ڕستەی (برایێ تە چیرۆك نڤیسییە).

وشەی (تە) جێناوە، دیارخەری ناوی (برا)یە، چونکە واتای وشەی (برا)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی چیرۆك ناوە، تەواوکەری نڤیسییە، واتە بەرکارە چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەرییەتی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٩- لە ڕستەی (کتێب ژوی وەرگرت).

وشەی کتێب ناوە دیارخەری کاری (وەرگرت)ە واتە بەرکارە چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەرییەتی کارەکەشی کەوتۆتە سەر، وشەی (وی) جێناوە تەواوکەری بە یاریدەی کاری (وەرگرت)ە.

چونکە واتای کارەکەی بە یارمەتیی ئامرازی پەیوەندی (ژ) زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

١٠- لە ڕستەی (دەشتا هەڤلێرێ بە پیتە).

وشەی هەڤلێرێ ناوە، دیارخەری ناوی (دەشت)ە، چونکە واتای وشەی (دەشت)ی تەواوکردووە کە نیهادە، وشەی (بە پیت) هاوەڵناوە تەواوکەری کاری ناتەواوی (ە)یە.

**دەستوور:**

**تەواوکەر: ئەو وشەیەیە یان ئەو وشانەیە کە لەڕستەدا دەبینرێن بێجگە لە بنچینەکانی ڕستەدا.**

**تەواوکەر دوو جۆرە:**

**أ- تەواوکەری یان دیارخەری ناو: بریتییە لە ( ناو، جێناو، هاوەڵناو)**

**ب- تەواوکەری کار: بریتییە لە (بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە، هاوەڵکار).**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا تەواوکەری ناو و تەواوکەری کار دەربهێنە:

١. مرۆڤی زانا پێش دەکەوێت.

٢. چیاکانی کوردستان بەرزن.

٣. بارام گۆڤارەکەی هێناوە.

٤. پار چووین بۆ سەیران.

٥. بازنێ زێڕ ب نرخە.

٦. دارا کتێبەکەی لە کتێبخانە کڕی.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك ببنە دیارخەری ناو.

{ڕەز، گوڵ، چێشت، بە پەلە، بە دووەم، زانست، کارگە، ڕووبار}

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك ببنە تەواوکەری کار.

{ ڕەز، گوڵ، چێشت، بە پەلە، بە دووەم، زانست، کارگە، ڕووبار}

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە (شلۆڤە بکەوە):

١. ئازادی برادەرم کتێب دەفرۆشێت.

٢. دارڤان داران دبڕن.

٣. سەرهید کتێبەکەی لە کتێبخانە وەرگرت.

# - نــــاو -

**ئەم نووسینە بخوێنەوە:**

(سەرەتای بەهار بوو، تازە گوڵو لالەی ئـەوە دەشـتو دەرە سـەریان دەرهێنابوو، بە دەم شنە بای فێنك پێدەكەنین. نێرگـزو بـەیبون و مێلاقـەو شلێر ئەو ناوەیان خەملاند بوو. بەرخو كاریلە دەمیان لـە گیـای بـەهارێ نابوو، قاسپەی كەو لە ترۆپكو قەد پاڵەكاندا دەنگی دەدایـەوە، هـەتاوی نەورۆزیی لە لووتكەی چیا بڵندەكەی ئەو بەر گوندەكەمان هەڵات. تیشكی زیوینی بەسەر بەفری لاپاڵی شـاخەكاندا، بەسـەر لالـەزارو گـوڵزاری ئـەو ناوەدا پەخش كرد. كورو كـچ، لاوو پـیری گونـدێ مـەتێكرا خۆیـان بـۆ سەیرانی نەورۆز ئامادەكردبوو، دەستەو كۆمەڵ پێكڤـە بـەرەو سـەیرانگای ناوچەكە دەچـوون. خـەڵك لـە گونـدەكانی دەرووبـەریش ڕوویـان لـەو سەیرانگایە كرد، لەوێ هەموو بە یەك دڵ گۆرانیو ستران و سروودیان بـۆ ئەو جەژنە نەتەوەییە دەچڕاند، من و كاوەی برادەریشم ڕوومان لەوێ كرد. شـاییو گۆڤەنـد دەسـتی پێكـرد، سـێ پێـیو ڕەشـبەڵەك، شـێخانیو سوسكەیی، سەماوەر لە هەموو لایەك جۆشدراو چا خورایەوە، دیسان كـوڕو كچێت گوندییان دەستیان تێك گرتن و زەمانـدو هەڵپـەڕكێ دەسـتی پـێ كردەوە، ئێڤارێ، هەموو بە دڵێكی پڕ لـە خۆشـیو شـادی، بـە ئـازادیو تەناهی بەرەڤ گوندێن خۆ گەڕانەوە پاش ئەوەی چاویان بە جـوانی بـەهار گەشایەوە).

## خستنه ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەڤ دەقە ئەدەبییەی سەرەوە دەبینین پەیڤو بێژەی وای تێدایە کە:

١. هەندێکیان ناوی گیاندارێك دیار دەکەن (ئاژەڵ بێ یان ڕووەك) وەك (بەرخ، کاریلە، نێرگز، مێلاقە، شلێر).

٢. یان وشەی وا هەیە لەناو نووسینەکەدا کە ناون بۆ شتی بێ گیان وەك (نان، سەماوەر، چا).

٣. هەندێ پەیڤی تێدایە کە ناون بۆ دیاری کردنی جێگاو شوێن وەك (گوند، سەیرانگا).

٤. دیسان نووسینەکە پەیڤی وای تێدایە کە ناوی کەسێکی دیارو تایبەتی پیشان دەدا وەك (کاوە).

٥. هەر لەو نووسینەدا جۆرە وشەی وا بەرچاو دەکەوێ کە بیرێك یان هەستێك پیشان دەدەن وەك (خۆشی، شادی، ئازادی، تەناهی، جوانی).

بەم جۆرە هەر وشەیەك لەوانەی کە دەرمان خستن‌و نیشانمان دان بۆ دەربڕینی مەبەستێك بەکارمان هێناون، پێیان دەڵێن (ناو).

## دەستوور:

**ناو وشەو بێژەییێکە بەکاردێت بۆ ناونان و دیاری کردن و پیشاندانی گیاندارێك (مرۆڤ بێ، ئاژەڵ، یان ڕووەك) یان بێ گیانێك (شت بێ یان شوێن) یان بیرو مەبەستێك.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستەو هۆنراوانەدا ناوەکان دەست نیشان بکەو ئینجا بیان نووسەوە:

١. ڕیی هـ[١] دبی بۆست[٢]، دوژمن نابی دۆست.

٢. من جوتیارم، من جوتیارم
من لەگەڵ هەتاو هاوکارم
من بە ئارەق و ئەو بەتین
دامان ڕشتووە بناخەی ژین

٣. ئاگر نیشانەی جەژنی نەورۆزە.

٤. ئەو ئەرخەوانە جوانە	کە لە گردی سەیوانە
بەڕیزە ئەو کچانە	وەك قومری[٣] دەوریان داوە.

٥. دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگێ من دوو دۆخ
یەك لسینە یەك لدل دا لەو ژمن تێن ئاخ و ئۆخ

---

(١) ڕیی هـ= ڕدێن، ڕیش

(٢) بۆست= بست

(٣) قومری= باڵندەیەکی دەنگ خۆشە لە کۆتر بچووکترە.

## ڕاهێنانی (٢)

بەم بۆشاییانە بە ناوێك پڕ بکەوە:

١. هەولێر ........... هەرێمی فیدرالی کوردستانی عیراقە.

٢. هەنگ شیلەی ...........دەمژێ و ........... دروست دەکا.

٣. شانۆ ........... ی گەلە.

٤. ........... ئەندامێ دیتنێیە.

٥. ئاڤا ........... ژ بەفرو بارانێ پەیدا دبیت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ناوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

١. ڕاستی ٢. هەنار ٣. ڕەزڤان ٤. برادۆست ٥. هەڵەبجە

## ڕاهێنانی (٤)

١. بارام نووست.

بارام: ناوە، بکەرە

نوست: کارە، ڕابوردووە

٢. ئەم ڕستانە شی بکەرەوە:

١. شیلان هات. ٢. شێروانی هەرمی خار.

---

١) مێلاقە= جۆرە گوڵێکی چیاییە.

٢) ترۆپك = لوتکە، سەرێ چیای.

٣) قەدپاڵەکان = لا پاڵی چیای.

٤) پەخش کرد= بەلاڤ کر، بڵاوی کردەوە.

(وانەی چواردەهەم)

# جۆرەکانی ناو

## أ- ناو لەڕووی ناوەڕۆکەوە

## ناوی تایبەتی- گشتی- کۆمەڵ

**لەوانەی پەروەردەی نیشتمانیدا مامۆستا گوتی:**

**(( هەرێمی فیدراڵی کوردستانی عیراق ئانکو باشورا کوردستانێ، لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ز گۆڕانێکی زۆری بە خۆوە دیت، ئەڤ هەرێمە لە چوار پارێزگا پێك دێت، هەولێرو سلێمانیو کەرکووكو دهۆك، چەند قەزاییکی تریش هەن کە بەشێکن لەو هەرێمە وەکو خانەقینو شەنگارو بەدرە. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕێڤەبەریا کوردی گەلێك پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە هاتنە جێ بەجێ کردن. سەدان باژێرو گوندو دێ نۆژەن کرانەوەو سەر لەنوو هاتن ئاڤاکرن، سەدان کیلۆمەتر ڕێو بان دروستکران. ژمارەیەکی زۆری کارگەو کارخانە کەوتنەوە گەڕ، بایەخ درا بە کاروباری چاندنو کتشوکاڵ بە ڤەژیاندنا سامانی ئاژەڵو بەخێوکردنی مەڕو بزنو پەزو گاو چێلو مریشك. پەرلەمانی کوردستانو حکومەتی هەرێم ژی هاتن دامەزراندن. گەلی کورد لەم بەشەی کوردستاندا دەسەلاتی گرتە دەست.**

**دوو زانکۆی تازە لە سلێمانیو دهۆكو دەیان قوتابخانەو خاندنگە کرانەوە. نازدارا کچا منو سەربەستێ برایێ وێ لەم دوو زانکۆیەدا دەخوێنن. کۆمەڵی کوردەواری لە گەلێك لایەنەوە پێش کەفت. لەبەر هەندێ پێویستە بە دڵو گیان ئەزموونی دیموکراتی گەلی خۆمان بپارێزینو هەموو ببین بە سەرباز بۆ پاراستنا ڤان دەستکەفتان).**

## خستنه ڕوو:

ئەگەر بە وردی پەیڤەکانی مامۆستای پەروەردەی نیشتمانی بخوێنینەوە، دەبینین چەند ڕستەیەکی تێدایە وەکو:

١. ئەڤ هەرێمە لەچوار پارێزگا پێك دێتن هەولێرو سلێمانیو کەرکووکو دهۆك.

٢. سەدان باژێرو گوندو دێ نۆژەن کرانەوەو سەر لەنوو هاتن ئاڤاکرن.

٣. بایەخ درا بە کاروباری چاندنو کشتوکاڵو بە ڤەژیاندنا سامانی ئاژەڵو بەخێوکردنی مەڕو بزنو پەزو گاو چێڵو مریشك.

٤. نازدارا کچامنو سەربەستێ برایێ وێ لەم دوو زانکۆیە دەخوێنن.

٥. گەلی کورد لەم بەشەی کوردستاندا دەسەڵاتی گرتە دەست.

دیسان ئەگەر بە وردی بەرێ خۆ بدەینە ڕستەکان دەبینین:

لە ڕستەی یەکەمدا ناوی چەند باژێرو شارێك هاتووە کە دەکەونە هەرێمی کوردستان وەك (هەولێر، سلێمانی، کەرکووك، دهۆك) کە هەر یەك ژوان، ناوە بۆ شارێکی دیاری کراوو ناوەکە دەبێتە ناوی تایبەتی.

لە ڕستەی دووەمدا وشەو بێژەکانی (باژێر، گوند، دێ) هەر یەکەیان ناوەو بەسەر هەموو گوندو دێو باژێرێکدا دابڕاوە چونکە لە یەك ڕەگەزن، بۆیێ ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێ ناوی گشتی.

لە ڕستەی سێیەمیش دا دیسان بێژەکانی (مەڕ، بزن، پەز، گا، چێڵ، مریشك) کە جانەوەرو گیاندارن، ناوی گشتین چونکە بۆ ڕەگەزی ئەو گیاندارانەو بۆ تاکە تاکەیان بەکار دێ.

لە ڕستەی چوارەمدا وشەکانی (نازدار، سەربەست) دوو ناون کە بۆ دوو کەسی دیاری دەست نیشان کراو بەکارهاتوون و پێیان دەگوترێ ناوی تایبەتی.

لە ڕستەی پێنجەمیشدا وشەی (گەل) لە ڕواڵەتدا تاکە بەلام لە ناوەڕۆك و واتادا (کۆ)یە، چونکە بێژەکە تێکڕا ئەو هەموو کەسە دەگرێتەوە کە پێکڤە پێیان دەگوترێ گەل، ئەو جۆرە ناوەش پێی دەگوترێ ناوی کۆمەڵ.

## دەستوور:

**ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێ بە سێ جۆر:**

**١. ناوی تایبەتی: ئەو ناوەیە کە بەتایبەتی بەکاردێت بۆ ناونانی کەسێك یان شتێکی یان جێ و شوێنێکی دیاری کراوو تایبەت وەك:**

**(ئەڤین- شێرکۆ- نازدار- هەندرێن- مەتین- دهۆك- کەرکووك- کورد)**

**ناوی تایبەتیش بۆی هەیە:**

**أ- ناوی کەسان بێت.**

**ب- ناوی ڕووبارو چیاو شارو گوند بێت.**

**ج- ناوی وڵاتو میللەت بێت.**

**٢. ناوی گشتی: ئەو ناوەیە کە بۆ هەموو ئەو گیاندارو بێ گیانانە بەکاردێت کە خودانی یەك ڕەگەزن و ناوەکە بەسەر تێکڕاو بەسەر تاکە تاکەی ئەو ڕەگەزانە دابڕاوە. ئەو جۆرە ناوەش بۆی هەیە:**

**أ- بۆ کەسان بەکاربێت وەك: مامۆستا، کچ، کوڕ، دایك.**

ب- بۆ ئاژەڵو باڵندەو ڕووەكو میوە بەكاربێت وەك: شێر، گورگ، ماین، هرچ، پەز، كەو، كۆتر، مراوی، گەنم، جۆ، سێو، هەنجیر.

ج- بۆ شتان بەكاربێت (بێ گیان) وەك: بەرد، دار، چیا، ڕووبار، خانوو.

٣. ناوی كۆمەڵ: ناوێكە بە ڕواڵەت تاك پیشان دەدا بەڵام لە ناوەڕۆك واتای كۆ دەبەخشێ، ئەم جۆرە ناوەش بۆی هەیە:

أ- بۆ كۆمەڵێك كەس بەكاربێت وەك: لەشكر، گەل، میللەت، هۆز، دەستە، چین، تیرە.

ب- بۆ هەژمارەك گیاندارو ڕووەك بەكاربێت وەك: گاڕان، مێگەل، ڕەوە، گەلە، ڕان، گاگەل، كەری پەزێ، ڕەڤد (ڕەڤدا گورگان)، ڕەز، چەپك، دەسك، قامك.

## ڕاهێنانی (١)

جۆری ئەم ناوانە نیشان بدە:

پیاو، زۆزك، قوتابی، جەژن، نێرگز، ئەحمەدی خانی، مێگەل، میللەت، زەردەشت.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم پارچە هۆنراوەیەدا ناوەكان دەست نیشان بكەو جۆرەكانیشیان دیار بخە.

| | |
|---|---|
| بۆ ڕۆژی نەورۆز سێ چەپك | لە نێرگزو گوڵی ناسك |
| ئەكەم بە دیارییەكی جوان | بۆ گەلی كوردی قارەمان |
| گوڵاڵە سوورەی پارچەی دڵ | هی دڵێك كە كەوتە ژێر گڵ |

| | |
|---|---|
| دڵی ئەو لاوەی بۆ میللەت | جەڕانیان[1] لە گەردنیا پەت |
| چرای گیانیان کوژانەوە | شەماڵ جەستەی شەکانەوە |
| ئەم چەپکە گوڵەی من پێشکەش | بەوەی گڕ ئەگرێتە باوەش |
| بەو لاوانەی کە بۆ وەتەن | لە خەباتا پشوو نادەن |
| بۆ ژینی کورد بوون بە پێشەنگ | بوون بە مەشخەڵی شەوە زەنگ |

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانە بە ناوێکی گشتی پڕ بکەوە:

١. باخەکەمان ........... ی جوانی تێدایە.

٢. چەم بێ ........... نابێ.

٣. پێویستە ........... هەموو ساڵێك لەوانەکانی دەرچێت.

٤. ........... لە بەسرە زۆرە.

٥. ........... نەخۆشی بلاو دەکاتەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

وشە هێڵ بەژێر داهاتووەکان لەم ڕستانەدا شی بکەوە:

١. ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ ئاڤ دا.

٢. لەشکر سنوورەکانی وڵات دەپارێزێ.

٣. سێڤێن بەروارییا بناڤ و دەنگن.

٤. چەپکە گوڵێکم بۆ مامۆستا برد.

٥. سلێمانی شاری هەڵمەتو قوربانییە.

---

(١) جەڕانیان لە گەردنیا پەت= پەتك ل گەردەنێ وی ئالاند.

# جۆرەکانی ناو

## ب- ناو لەڕووی هەبوونەوە

## ناوی بەرجەستەو ناوی واتایی

**جوتیارێك گێڕایەوەو گوتی:**

**(( ڕۆژەکە زۆر ساردبوو، هەوری ڕەش سەرتاپا ئاسمانی ناوچەکەی داپۆشیبوو، زەوی گەلەك تێنوو بوو، ئارەزووی بارانی دەکرد، لە ناکاو کردی بە هەورە تریشقەو لێزمەی باران، جوتیارو شڤان و گاوان، کەوتنە خۆشی و شادی، چونکە کە بەفرو باران زۆر بوو، کانیاو دەردەبن، ئاوی چەم و ڕووبار زۆر دەبێ، لە بەهاردا جوانی هەموو لایێکی سروشت دەگرێتەوە، خەم و پەژارە لە دڵ نامێنێ، هێزو وزە دەکەوێتە گیانی زیندەوەرو چانەواران. لەم وەرزەدا بەرهەمی ئاژەڵان زۆر دەبێ وەك ماست و پەنیرو فرۆو لۆرو سەرتوو نیڤشك)).**

### خستنە ڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەم نووسینەی سەرەوەدا چەند ڕستەیەك دێنە بەرچاو وەك:

١. ڕۆژەکە ساردبوو، هەوری ڕەش سەرتاپا ئاسمانی ناوچەکەی داپۆشیبوو.

٢. لەم وەرزەدا بەرهەمی ئاژەڵان زۆر دەبێ وەك ماست و پەنیرو فرۆو لۆرو سەرتوو نیڤشك.

٣. له ناكاو كردی به هەورە تریشقەو لێزمەی باران، جوتیارو شڤانو گاوان كەوتنە خۆشیو شادی.

٤. له بەهاردا جوانی هەموو لایێكی سروشت دەگرێتەوە، خەمو پەژارە له دڵ نامێنێ. ڕستەی یەكەم هەندێك ناوی تێدایە كە ئێمە لێرەدا مەبەستمانن ناوەكانیش بریتین له (هەور، ئاسمان) كه لەو ناوانەن وە بەر یەكێك له هەستەكانی مرۆڤ دەكەون ئەویش هەستی بینینە، لەبەر هەندێ ناوەكان پێیان دەگوترێ ناوی بەرجەستە.

له ڕستەی دووەمیشدا كۆمەڵە ناوێك هەن كە هەر یەكەیان وەبەر هەستێك یا پتر لە هەستێكی مرۆڤ دەكەونو پێیان دەگوترێ ناوی بەرجەستە وەك ماست، پەنیر، فرۆ، لۆر، سەرتوو، نیڤشك.

ئەگەر له ڕستەی سێیەم ڕامینێین، دەبینین ڕستەكە هەژمارەك ناوی تێدایە، بەڵام ئەوی مەبەستمانە هەر دوو ناوی (خۆشیو شادی)یە كە لە خۆیاندا بوونی سەربەخۆیان نییە، ناكەونە بەر یەكێك لە پێنج هەستەكەی مرۆڤ بەڵكو تەنیا لە بیرو خەیاڵو هزردا بوونیان هەیە، ناوەكانی ئەم چەشنەش پێیان دەگوترێ ناوی واتایی.

دیسان له ڕستەی چوارەمدا ناوەكانی (جوانی، خەم، پەژارە) وەبەر ئەو جۆرە ناوانە دەكەون كە لەهزرو خەیاڵدا پەیدا دەبنو بەر هیچ یەك لەو پێنج هەستەی كە مرۆڤ هەیەتی ناكەون، بۆیێ بەوان ژی دەگوترێ ناوی واتایی.

ناوی واتاییش دوو جۆری هەیە:

أ- ناوی واتایی بنجی کە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن وەك خەم، هێز، وزە، هۆش، باوەڕ، ترس، مەرگ.

ب- ناوی واتایی دروستکراو کە لەوشەیەکی بەرجەستە یان واتایی بە یاریدەی پاشگرێك دروست دەکرێ وەك: مێرانی، کوردینی، دۆستایەتی، پیاوەتی، ڕەشایی، مەزناتی، جوانی.

## دەستوور:

**لە ڕووی هەبوونەوە ناو دوو جۆرە:**

1. **ناوی بەرجەستە: ئەو ناوەیە کە وەبەر یەك لە پێنج هەستەکانی مرۆڤ دەکەوێت و بوونی سەربەخۆی هەیە.**
2. **ناوی واتایی: ناوێکە لە خۆیدا بوونی سەربەخۆی نییە، بەر هیچ یەك لە هەستەکانی مرۆڤ ناکەون، تەنیا لە بیرو خەیاڵدا پەیدا دەبن، ئەویش دوو جۆرە:**

**أ- بنجی** **ب- دروستکراو.**

## ڕاهێنانی (1)

ئەم ناوە واتاییانە لە ڕستەدا بەکاربێنە.

مرۆڤینی- زیرەکی- برایەتی- جەنگ- ئاشتی.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم دێڕە هۆنراوانەدا هەر ناوێکی واتایی هەیە دەری بهێنە، جۆرەکەشی پیشان بدە:

١. جوامێری‌و هیمەت‌و سەخاوەت
میرینی‌و غیرەت‌و جەلادەت
ئەو خەتمە ژێۆ قەبیلی ئەکراد
وان دانە بە شیرو هیمەت‌و داد

٢. هەربینا[(١)] دیت ڕمی[(٢)] کۆشکی زۆرداری
گەیشتینە لووتکەی چیای ڕزگاری
ڕەوی[(٣)] تەمی خەم‌و مژی پەژارە
بووژانەوە[(٤)] ئەو هەتیوە هەژارە

٣. تێکۆشە دایم هەر وەکو هەنگ بە
لە مەیدانی ژین ئامادەی جەنگ بە
ئەوا پێت ئەڵێم چاکی بزانە
ژیانی مەردی باری گرانە

---

(١) هەربینا= هەر ئەوەندەت زانی.
(٢) ڕمی= ڕما- هەر فت- ڕووخا.
(٣) ڕەوی= ڕەوییەوە- نەما- ڕەڤی.
(٤) بوژانەوە= ژیانەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستانە هەر ناوێکی بەرجەستە هەیە دەست نیشانیان بکە:

١. تریفە بەیانیان هێلکەو نیڤشك دەخوات.

٢. گەنمو جۆ دوو بەرهەمی زستانەن.

٣. لبەهارێ خوناڤ[1] دکەفیتە سەر پەلکێت داران

٤. مەتینی دەستێ خۆ ب تەڤشوی[2] بڕی.

٥. جوتیاری زەڤی کێلا.

## ڕاهێنانی (٤)

شیکردنەوە (شلۆڤەکردن):

١. کەوەکەی خەسرەو دەخوێنێت.

کەوەکە: ناوە، گتشییە، بەرجەستەیە، بکەرە، ناسراوە.

ی: ئامرای دانەپاڵە.

خەسرەو: ناوە، تایبەتییە، تەواوکەری ناوی کەوەکەیە.

دەخوێنێت: کارە، ڕانەبوردووە.

ێت: جێناوی لکاوە، جێی کەوەکەی گرتووە کە بکەرە.

٢. ئەم ڕستانە شی بکەوە:

١. ترس مرۆڤ دەتۆقێنێ.

٢. خوێندەواری چرای ژیانە.

---

(١) خوناڤ = خوناو، ئاونگ، شەونم.

(٢) ب تەڤشوی= بە تەشوێ.

(وانەی پانزەهەم)

# ئەرکی ناو لەڕستەدا

## ڕستەکان:

١. پیرۆت نانی خوارد.

پیرۆتی نان خار.

٢. کوڕەکەی پیرۆت ئەندازیارە.

کوڕێ پیرۆتی ئەندازیارە.

٣. پیرۆتم لە شاری هەولێر دیت.

من پیرۆت لباژێرێ هەولێرێ دیت.

٤. کتێبەکەم لە پیرۆت وەرگرت.

من کتێب ژ پیرۆتی وەرگرت.

٥. ئەم کتێبە ئی پیرۆتە.

ئەڤ کتێبە یا پیرۆتییە .

٦. پیرۆت زیرەکە.

پیرۆت یێ زیرەکە.

## خستنە ڕوو:

لە تەماشاکردن و سەرنجدانی ئەو کۆمەڵە ڕستەی سەرەوە، ژمارە ناوێکمان دێتە بەرچاو وەك: (پیرۆت، نان، کوڕ، ئەندازیار، شار، باژێر، کتێب).

ئەڤ ناوانە دەچنەوە سەر جۆرێك لەو جۆرانەی ناو کە لەمەوپێش باسمان کردن. بەڵام لە ڕووی ئەو ئەرکەی کە بەو ناوانەمان سپاردووە، هەر یەکەیان ئەرك‌و کارێکی جودای هەیە، بۆ نموونە:

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی یەکەمدا کاری نان خواردنەکەی دراوەتە پاڵ، واتە کردەوەی خواردنی نانەکە لەلایەن پیرۆتەوە جێ بەجێ کراوە، لەبەر هەندێ ناوی پیرۆت بووە بە بکەر. هەر ئەو ناوەی (پیرۆت) لە ڕستەی ژمارە دوودا ئەرکەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە ئەگەر هەر ناوی (کوڕەکە)مان بهێنایە، لەوانە بوو بپرسی کە کوڕەکە ئی کێیە؟ بۆیێ پیرۆت بووە بە دیارخەری ناوی (کوڕەکە) واتە بووە بە دیارخەری ناوێك کە بکەرە.

لە ڕستەی سێیەمیشدا دیسان ئەرکی (پیرۆت) گۆڕاوە، لڤێرێدا (پیرۆت) کەوتووتە بەر کاریگەرییەتی کاری تێپەڕی (دیت)و بووە بە (بەرکار) چونکە ئەگەر ناوی (پیرۆت)مان نەهێنابایە، نەمان دەزانی کێ بینراوە.

لە ڕستەی ژمارە چواردا ناوی پیرۆت بە هۆی ئامرازی پەیوەندی (لە، ژ) بووە بە تەواوکەری بە یاریدە.

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی پێنجەمدا بووە بە تەواوکەر بۆ کارێکی ناتەواو کە ئەویش کاری ناتەواوی (ە)ی کاتی ئێستایە، بۆیێ (پیرۆت) بووە بە تەواوکەری کاری ناتەواو.

لە ڕستەی ژمارە شەشدا، ناوی (پیرۆت) سیفەتێکی دراوەتە پاڵ کە ئەویش زیرەکییە. کاری ڕستەکەش ناتەواوە، لەبەر ئەوە ناوی (پیرۆت) لێرەدا دەبێتە نیهاد.

کەواتە (پیرۆت) وەکو ناوێکی تایبەتی لەو ڕستانەدا شەش ئەرکمان پێ سپاردووە، هەروەك لە ڕستەکاندا ئاشکرا دەبن.

## دەستوور:

**ئەرکی ناو لە ڕستەدا بەپێی ئەو کارەی کە پێی دەسپێردرێ لە گۆڕان دایە، بە گشتی ناو لە ڕستەدا دەبێتە:**

1. **بکەری ڕستەکە ئەگەر کارەکە لەلایەن ناوەکەوە جێ بەجێ بکرێ.**
2. **بەرکار ئەگەر کاریگەرییەتی کارەکە یەکسەر بکەوێتە سەر ناوەکە، بە مەرجێك کاری ڕستەکە تێپەڕ بێت.**
3. **دیارخەری ناوێکی دی، کە لەم بارەدا دبێژنێ (دیارخەری ناو).**
4. **تەواوکەر بۆ ئامرازێکی پەیوەندیو ئەو کاتە پێی دەگوترێ (تەواوکەری بە یاریدە)، لەم بارەشدا پێتقیە ئامرازێکی پەیوەندی بکەوێتە پێش ناوەکەو ناوەکە دەبێتە تەواوکەری بە یاریدە.**
5. **تەواوکەری کاری ناتەواو.**
6. **نیهاد ئەگەر خەبەرێك یان سیفەتێکی درایە پاڵو کاری ڕستەکەش ناتەواو بوو.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەدا ئەرکی ئەو ناوانە پیشان بدە کە هێلیان بەژێردا کێشراوە.

١. هاوین گەرمە.

٢. برام چوو بۆ دهۆك.

٣. شۆڕشڤانان دوژمن شکاندن.

٤. شووشەی دەرمان دەبێ پاك بێت.

٥. سەرداری وانە نڤیسی.

٦. باران لە هەور پەیدا دەبێ.

٧. ئەز هەر هەیڤێ جارەکێ زەڤیا توتنێ ئاڤدەدەم.

## ڕاهێنانی (٢)

نموونەی ڕستەیی بۆ ئەم مەبەستانە بهێنەوە:

١. ناوێکی تایبەتی بووبێتە نیهاد.

٢. ناوێکی گشتی بووبێتە تەواوکەری بەیاریدە.

٣. ناوێکی گشتی وەکو بەرکار بەکار هاتبێ.

٤. ناوێکی تایبەتی بووبێتە تەواوکەری کاری ناتەواوی ئێستا.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

١. کچا لەزگینی مامۆستایە.

٢. هەڤالم لە هەڵەبجە دیت.

( وانەی شازدەهەم )

# ( جێـــناو )

## أ. جێناوی کەسی سەربەخۆ

**ئەم نووسینەی خوارەوە بخوێنەوە:**

(( نیشتمان ئێمەی لە باوەشی خۆی گرتووەو لەژێر سێبەریدا من و تـۆ، بە خۆشیو شادییەوە دەژین. کوردسـتان وڵاتـی دێرینـی کـوردە، بـاوو باپیرانی هەموومان زادەی ئەم خاکە پیرۆزەن، ئەوان هەر لەبـەرە بـەیانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە، لەسەر خاکی پیرۆزی کوردسـتاندا دێو گونـدیان ئاوەدان کردەوەو بە چاندنو کشتوکاڵەوە خۆیـان خـەریك کـردووە. لـە مێژووی کوردستاندا پیاوی مەزنو پاڵەوان زۆرن. کاوەی ئاسنگەر نموونەی تێکۆشەری چەوساوەی میللەتەکەمانە. ئەو بە بازووی پۆڵایینو بە باوەڕی پڕ هێزی، شیا تەختو بەختی زوحاکی دکتاتۆر سەرنگون بکا. ئێـوە پێویـستە شارەزای پاڵەوانانی مێژووی گەلی خۆتان بنو ئەوان بکەن بە نموونەو بـە پێشڕەو بۆ خۆتان )).

**خستنە ڕوو:**

لە خوێندنەوەی ئـەم دەقـەی سـەرەوە هەنـدێ وشـەو بێـژەی وامـان بەرچـاو دەکـەوێ کـە شـوێنو جێـی کەسـێك یـان چـەند کەسـانێکیان گرتووە، لـە هـەمان کاتیـشدا واتـای کەسـەکە یـان کەسـەکانیان نیشان

داوەو پەیوەندییان بە کەسانی ترەوە ڕاگەیاندوە. بۆ نموونە لە دەقەکەدا وشەی (من) بەرچاو دەکەوێ کە لەجیاتی تاکە کەسێك بەکارهاتووە کە ئاخێوەر واتە قسەکەرەو دەبێتە (کەسی یەکەمی تاك).

وشەی (ئێمە)ش بەرچاو دەکەوێ کە ئەویش لە جێی ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە ئاخێوەرن‌و پێیان دەگوترێ (کەسی یەکەمی کۆ).

دیسان لە دەقەکەدا وشەی (تۆ) دێتە بەرچاوان، ئەویش لە جێی ئەو کەسە بەکارمان هێناوە کە ڕووی قسەی تێدەکەین‌و لەگەڵیدا دەئاخڤێن. ئەو ژی (کەسی دووەمی تاکە) کە گوێگر ئانکۆ گۆهدارە.

هەر بەم جۆرە ئەگەر لە خوێندنەوەی دەقەکە بەردەوام بین، تووشی وشەی (ئێوە) دەبین کە ئەویش جێناوی سەربەخۆی (کەسی دووەمی کۆ)یەو جێی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەین‌و دەبنە گوێگر یان گۆهدار.

وشەی (ئەو) کە هەر لە نووسینەکەدا دهێتە دیتن. بۆ ئەو کەسەمان بەکارهێناوە کە بزرەو بە کەسی سێیەمی تاك دهێتە ناسین، واتە جێناوی (ئەو) شوێنی کەسێك دەگرێتەوە کە لەبەر چاوان نییەو لێمانەوە دیار نییە، کەچی دەبینین وشەی (ئەوان) بۆ چەند کەسێك بەکاردێ کە لێمانەوە دیارنین‌و بزرن، ئەو کەسانەش بە (کەسی سێیەمی کۆ) ناو دەبرێن.

## دەستوور:

جێناوی کەسیی سەربەخۆ، ئەو وشانەن کە سەربەخۆ دهێنە گۆتن‌و واتای کەسەکە یان کەسەکان نیشان دەدەن‌و پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕوون دەکەنەوە. واتاکانیشیان ئاشکرایەو لە ئاخافتن‌و نووسیندا شوێنی کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم دەگرنەوە بە تاك‌و کۆیانەوە. لە زاری کوردی کرمانجی خوارووا ئەم جێناوانە ئەمانەن:

١. **من- ئەمن:** بۆ کەسی یەکەمی تاك.
٢. **ئێمە- ئەمە:** بۆ کەسی یەکەمی کۆ.
٣. **تۆ- ئەتۆ- ئەتوو- توو:** بۆ کەسی دووەمی تاك.
٤. **ئێوە- ئەنگۆ:** بۆ کەسی سێیەمی تاك.
٥. **ئەو:** بۆ کەسی سێیەمی تاك.
٦. **ئەوان:** بۆ کەسی سێیەمی کۆ.

## ڕاهێنانی (١)

جێناوێکی کەسیی سەربەخۆ لە سەرەتای هەر ڕستەیەك لەم ڕستانە دابنێ:

١. پێم وایە ئەمساڵ هەمووتان دەردەچن.
٢. لێمان گەڕێ کارەکانمان بە پوختی جێ بەجێ بکەین.
٣. هەموو ڕۆژێك بەیانیان زۆر زوو لە خەو ڕادەبێت.
٤. خۆمان دەزانین کاروباری وڵاتەکەمان بەڕێوەببەین.
٥. کەی بە ئاواتی دێرینی خۆتان دەگەن؟

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستەیەدا، جێناوە کەسییە سەربەخۆکان لە تاکەوە بگۆڕە بۆ کۆ:

(( من لەهەموو کەس زیاتر سوودی تۆم دەوێ، بەڵام ئەو وانییەو سوودی منی ناوێ )).

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستانەدا جێناوە کەسییە سەربەخۆ ڕاستەکان هەڵبژێرە:

١. (من- ئەو) ئارەزووی گەشتو گوزار دەکات.

٢. (ئەوان- ئێمە) بە فڕۆکە دەچین بۆ پاریس.

٣. (تۆ- ئەنگۆ) بخوێنن تا بە ئاوات دەگەن.

٤. (من- ئەوان) چاویان بە ئێوە کەوت.

٥. (ئەو- تۆ) پیاوی دوا ڕۆژە.

## ب- جێناوی کەسی سەربەخۆ

**ڕستەکان:**

١. من سیڤەك خار.

٢. مە ئاگرێ نەورۆزێ لسەرێ چیایا هەلکر.

٣. تە نامە بۆ هەڤالێ خۆ نڤیسی.

٤. وە خەبات ژ بۆ ئازادییێ و سەرفرازییێ کر.

٥. وی بارەك ترێ برە دهۆکێ بۆ فرۆتنێ.

٦. وێ گەلەك چیرۆکێن کوردی بۆ مە گۆتن.

٧. وان ڕێزمانا کوردی خاند.

**خستنەڕوو:**

ئەگەر لە ڕستەکانی لای سەرەوە وردبینەوە دەبنین لە هەر ڕستەیەکدا وشەیەك هەیە کە لەجێی ناوی ئەو کەسە یان ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە کارەکەیان کردووە یان کارەکەیان دراوەتە پاڵ وشەکان بە تەواوی جێی ناوەکانیان گرتووە بۆیێ پێیان دەڵێین جێناوی کەسیی سەربەخۆ.

١. لە ڕستەی یەکەمدا (من) لە جیاتی کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووە کە قسەکەرە.

٢. لە ڕستەی یەکەمدا (مە) لە جێی کەسی یەکەمی کۆ بەکارهاتووە.

٣. له ڕستەی سێیەمدا (تە) بۆ کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە کە گوێگر یان گۆهدارە.

٤. له ڕستەی چوارەمدا (وە) بۆ کەسی دووەمی کۆ بەکارهاتووە.

٥. له هەردوو ڕستەی ژمارە پێنجو شەشدا، هەردوو وشەی (وی) و (وێ) بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکاردێن، (وی) بۆ تاکی نێرو (وێ) بۆ تاکی مێ.

٦. له ڕستەی حەوتەمیش دا وشەی (وان) بۆ کەسی سێیەمی کۆ بەکارهاتووە.

## دەستوور:

**لە کۆمەڵە جێناوی (ب)دا کە سەر بە شێوەزاری کوردی کرمانجی ژووروو جێناوەکانی (من- مە، تە- وە، وی- وێ- وان) لە جێی ناوی ئەو کەسە یان ئەو کەسانە بەکاردێن کە کارەکە دەکەن یان کارەکەیان دەدرێتە پاڵ. ئەم کۆمەڵە جێناوە لە هەردوو باری ئەرێنیو نەرێنیدا بەم جۆرە بەکاردێ:**

**١. لەگەڵ کاری هەبوون لە ڕابردوو و ڕانەبردوودا.**

| | |
|---|---|
| **أ- من هەیە** | **من نییە(نینە)** |
| **تە هەیە** | **تە نییە (نینە)** |
| **وی (وێ) هەیە** | **وی (وێ) نییە (نینە)** |
| **ب- من هەبوو** | **من نەبوو** |
| **تە هەبوو** | **تە نەبوو** |
| **وی (وێ) هەبوو** | **وی (وێ) نەبوو** |

٢. لەگەڵ كاری ویستن لە هەموو دەمەكانـدا (بـە ئـەرێنیو نـەرێنی)، (ویستن= ڤیان).




٣. لەگـەڵ كـاری ڕابـووردوی تێپـەڕ بـە هـەموو جۆرەكانیـەوە (بـە ئەرێنیو نەرێنی)؛

| | |
|---|---|
| من كڕی | من نەكڕی |
| تە كڕییە | تە نەكڕییە |
| وی (وێ) كڕ یبوو | وی (وێ) نەكڕ یبوو |
| مەدەكڕی | مە نەدەكڕی |

## ڕاهێنانی (١)

ئەڤ ڕستەیا ژێری دگەل هەمی جێناڤێت كەسیی سەربەخۆ بەكاربینە:

من هندەك پارە ژبرایێ خۆیێ مەزن ستاند.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە لە تاکەوە بکە بە کۆ:

١. تە ئەرکێ خۆ ب جهـ ئینا.

٢. من دگەل وی دەرس خاند.

٣. وێ دوهی ئازاد دیت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم دوو ڕستەیە شی بکەوە (شلۆڤە بکە):

١. وی کۆترەك گرت.

٢. وان پەز چەراند.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

ئاخێوەر : قسەکەر، ئەو کەسێ کو دئاخڤی

## ج. جێناوی کەسیی سەربەخۆ

**ئازادی گۆت (( ئەز کوردم و ئەز وەلات پارێزم، تۆ ژی کوردی، ژبەر هندێ پێدڤیە ئەم هەمی بئێك دل خزمەتا نیشتمانێ خۆ بکەین، ئەزو تو، ئەم و هوین، پێویستە بخوێنین، چونکە وەلات تەنێ بزانست و زانیارێی پێشڤە دەچیت، برایێ من ئەڤە دوو سالە لدەرڤەی کوردستان یێە، لوێرێ دخوینیت، ئەو خوێندنا پزیشکی لزانکۆیەکا بناڤ و دەنگ بدۆمینە، قوتابییێت هەڤالێن وی زیرەکن، ئەو هەمی زاناو شارەزانە)).**

## خستنەڕوو:

گەلی کورد تێنووی زانست و زانیارییە، ولاتیش هەر بەزانست پێش دەکەوێ، لەبەر ئەوە پێویستە هەموو هەوڵ و تێکۆشانمان بۆ فێربوونی زانست و زانیاری تەرخان بکەین.

لەم دەقەی سەرەوەدا ژمارەیەك جێناومان بەرچاو دەکەوێ کە هەریەکەیان جێی و شوێنی کەسێکی یان ژمارە کەسێکی گرتووە.

جێناوی (ئەز) بۆ کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووە کە ئەویش ئاخێوەر یا قسەکەرە.

جێناوی (تو) بۆ کەسی دووەمی تاك بەکارمان هێناوە کە گوێگرە.

جێناوی (ئەو) لە دەقەکەدا بەدوو شێوە بەکارهاتووە، جارێکیان بۆ کەسی تاکی نادیار یان بزر وەك لە ڕستەی ئەو (خویندنا پزیشکی لزانکۆیەکی بناڤ و دەنگ بدۆمینە)، جارێکیشیان بۆ کەسانی نادیار کە

(کەسی سێیەمی کۆ)یە وەك لە ڕستەی (قوتابییێت هەڤالێن وی زیرەکن، ئەو زاناو شارەزانە).

جێناوی (ئەم) بۆ کەسی یەکەمی کۆ، بەکارهاتووە.

## دەستوور:

**لە کۆمەڵە جێناوی کەسیی سەربەخۆی (جـ)دا کە ئەویش سەر بەزاری کوردی کرمانجی ژووروەوە، جێناوەکان لە جیاتی کەسێك یان ژمارە کەسێك بەکارهاتوون، وەك لە پێشا ڕوونمان کردەوە.**

**جێناوەکانیش لەم کۆمەڵەیەدا ئەمانەن:**

**١. ئەز کە جێی من دەگرێتەوە.**

**٢. ئەم واتە ئێمە.**

**٣. تو واتە تۆ.**

**٤. هوین واتە ئێوە، ئەنگۆ یان هنگ...**

**٥. ئەو کە بۆ (ئەو)ی تاك و (ئەوان)ی کۆ بەکاردێ.**

**کۆمەڵە جێناوی (جـ) بەم جۆرە بەکاردێ:**

**١. لەگەڵ کاری تێنەپەڕ لە هەموو دەمەکانیدا بە هەردوو دۆخی (ئەرێنیو نەرێنی)یەوە: وەك**

| | |
|---|---|
| **ئەز هاتم** | **ئەز نەهاتم** |
| **ئەز دهێم** | **ئەز ناهێم** |
| **ئەز دێ هێم** | **(ئەز ناهێم)** |

**٢. لەگەڵ کاری بوون (لە ڕابوردوو، ڕانەبوردوو، لەمەولا) لە هەردوو دۆخی (ئەرێنیو نەرێنی)دا: وەك**

| | |
|---|---|
| **ئەز بووم** | **ئەز نەبووم** |
| **ئەزم** | **ئەز نیمە (ئەز نینم)** |

ئەز دبم		ئەز نابم

ئەز دێ بم		ئەز نابم

٣. لەگەڵ کاری تێپەڕی ڕانەبوردووی کاتی ئێستاو لەمەولا (نهۆو پاشی) لە هەردوو دۆخی (ئەرێنیو نەرێنی)دا، وەك

ئەز دخۆم		ئەز ناخۆم

ئەز دێ خۆم		(ئەز ناخۆم)

## ڕاهێنانی (١)

جێناوێکی کەسیی سەربەخۆ لە بۆشاییەکان دابنێو هۆی بەکارهێنانی جێناوەکەش ڕوون بکەوە:

١. دوهی ........... دگەل هەڤالێ خۆ چووم بۆ فێرگەهێ.

٢. ........... ئەڤ پێنوسە بۆ برایێ خۆ کڕییە.

٣. ........... کچەکا زیرەكو جوانە.

٤. ........... دێ نانی خۆین.

٥. ........... دۆستو هەڤالێن خۆ لتەنگاڤیا بناسن.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

وێ- مە- ئەز- تە- هوین.

## ڕاهێنانی (٣)

ڤان دوو ڕستەیێن ژێری شی بکەڤە (شلۆڤەکە):

١. خوشکا من زیرەکە.		٢. بابێ تە ڕەزڤانە.

# چـــاوگ

| (١) | (٢) | (٣) |
|---|---|---|
| **چاوگ** | **قەدی چاوگ** | **کار ڕابوردووی نزیك (ڕووت)** |
| خوێندن | خوێند | خوێند |
| بڕین | بڕی | بڕی |
| کەوتن | کەوت | کەوت |
| برژان | برژا | برژا |
| بوون | بوو | بوو |

## خستنە ڕوو:

ئەگەر تەماشەیەکی کۆمەڵە پەیڤی (خوێندن، بڕین، کەوتن، برژان، بوون) بکەین دەبینین هەموویان کۆتاییان بە پیتی (ن) دێت، بەڵام پیتەکانی پێش (ن)ەکە جیاوازن‌و بریتین لە (د، ی، ت، ا، وو)، ئەگەر هەر یەکە لەو پەیڤانە لە ڕستەدا بەکاربهێنین دەبینین کردەوەیەك دەردەخەن بێ ئەوەی هیچ کاتێك دەست نیشان بکەین، بۆ نموونە کە دەڵێین:

خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

لەم ڕستەیەدا پەیڤی خوێندن کردەوەیەك دەردەخات بەڵام بێ ئەوەی کات‌و تافی ئەم کردەوەیە پیشان بدات، جگە لەمە پەیڤەکە

کۆتایی دێت بە پیتی (ن) بۆیە ئەم جۆرە پەیڤانە لەزمانی کوردیدا بە (چاوگ) ناو دەبرێنو سەرچاوەن بۆ دروستکردنی هەموو کارەکان.

لە زمانی کوردیدا پێنج جۆرە چاوگ هەن کە بەپیتی پێش (ن)ەکە دەناسرێنەوەو، کە ئەمانەن:

١. چاوگی دالی: وەکو خوێندن، بردن

٢. چاوگی یائی: وەکو نووووسین، بڕین، دڕین، سڕین.

٣. چاوگی تائی: وەکو کوشتن، فرۆشتن، هاتن.

٤. چاوگی ئەلفی: وەکو سووتان، دڕان، برژان.

٥. چاوگی واوی: وەکو چوون، بوون، دروون.

لە هەر چاوگێکدا ئەگەر (ن)ی چاوگەکە لابدەین ئەوەی دەمێنتەوە پێی دەگوترێت (قەدی چاوگ)، کە لە هەمان کاتیشدا دەبێتە کاری ڕابردووی نزیك (ڕووت)، دەتوانین لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە کە لەکاردا، کردەوەیەك هەیەو کاتێکی دیاریکراویش هەیە کە ئەم کردەوەیەی تیادا ڕوویداوە، بەڵام لە چاوگدا بوونی ئەم کاتە هەستی پێناکرێت. چاوگ سەرچاوەی دروستکردنی هەموو کارێکە لە هەموو تافو کاتێکی جیاوازدا.

## ڕاهێنانی (١)

چەند جۆرە چاوگمان هەیە؟ بۆ هەر جۆرێکیان دوو نموونە بنووسە.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم وشانەی خوارەوەدا چاوگەکان، دەربهێنە:

(( هەورامان، کێشان، بڕژان، جیهان، سەربان، کردن، نووستن، نازەنین، بڕین، دروون، چوون، پەخشان )).

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانەی خوارەوە ئەگەر ڕاستن، بەرامبەریان بنووسەوە ڕاستە، ئەگەر هەڵەن، ڕاستییەکەی بە تەواوی بنووسەرەوە.

١. چاوگ کارێك دەردەخات، تافێکی دیاریکراوی بۆ نییە.

٢. چاوگو کار هیچ جیاوازییەکیان نییە.

٣. هەر وشەیەك کۆتایی بە پیتی (ن) هاتبوو، ئەوا بەبێ چەندو چۆن چاوگە.

٤. بە لابردنی (ن)ی چاوگ، چاوگ وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

# کار لە ڕووی دەم و کاتەوە

## أ. کاری ڕابوردوو ( بوری )

مـــام ( هـــێمن )ی شـــاعیر لـــە پێـــشەکی دیـــوانی ( تـاریـــك و ڕوون )دا نووسیویەتیو دەڵێ:

(( من بۆ خۆم لە ئەزموونی پیـاوێکی دنیـا دیـدەو کۆنـساڵ کـەڵکم وەرگرتو توانیم بەشێکی زۆر لە دەغڵو دانی خۆمان لەڕزینو زایە بـوون ڕزگار بکەم

بەهار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو، بەڵام بـەفر ئارەقیـشی نـەدەکرد، ڕۆژێك چوومە مزگەوت، تەماشام کرد پیرە پیاوێك بـە تـەنێ لـە تەنیـشت سۆبە ساردو سڕەکە هەڵکوڕماوە، هەرمنی دیت گوتی: منداڵی ئەو زەمانـە ئێمەی پێ خەرفاوە، گوتم مامە گیان چ قەوماوە؟ گوتی: بەسەری تۆ ئـەوە چەند ڕۆژە بەو هەتیوە گێژانەی خۆم دەڵێم بچن بەفری سەر ڕەپستەکەمان کون کون بکەن گوێشم نادەنێ. گوتم: جا، بۆ کون کونی بکەن؟ گـوتی: بۆ تۆش نازانی؟ گوتم ناوەڵلا. گوتی بیلامانێ کە ساڵ درەنگ بـوو هـەرد گەرم دادێو هەڵمێ دەکا. بـەفریش نایـەڵێ هەڵمەکـە بێتـە دەرەوە لـە ناوخۆیدا دەگەڕێتەوەو دەغڵەکە دەسوتێ، ئەگەر کون بکـرێ هەڵمەکـەی دێتە دەرەوە ناسووتێ، قسەی مامە پیرەم بە دڵیەوە نووسا، بەڵام کارەکـە زۆر گرانبوو، بەفرەکە ئەوەندە ڕەق بوو بە لۆسە کون دەکرا، بەڵام پاشـان تێگەیشتم پەندی پێشینان چەند ڕاستە کە گووتویانە "دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە")).

## خستنه ڕوو:

ئەگەر بە وردی لەو دەقە ئەدەبییەی سەرەوە ورد بینەوە دەبینین کۆمەڵێك کاری ڕابووردووی (بۆری) بەخۆوە گرتووە، کە دەتوانین هەندێکیان دەست نیشان بکەین وەك (کەلکم وەرگرت، توانیم، گەرم ببوو، ئارەقیشی نەدەکرد، چوومە، هەڵکوڕماوە، دێت، نووسا، خۆش بوو،.... هتد). دیارە هەمووشمان ئەو ڕاستییە دەزانین کە کاری ڕابووردوو کارێکە ڕوودانو فەرمانی ئیشێك پیشان دەدا کە بەر لەکاتی ئاخافتن قەومابێ، واتا کە مرۆڤ لە کارەکە دەدوێ کارەکە ڕوویداوەو کاتەکەی بەسەرچووە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کارە ڕابوردووەکان، هەر چەندە لە ڕابوردوودا ڕوویان داوە جیاوازییێك لەکاتی ڕوودانیان هەیە، بۆ نموونە لە ڕستەی (من بەخۆم لە ئەزموونی پیاوێکی دنیا دیدەو کۆنساڵ کەڵکم وەرگرتو توانیم بەشێکی زۆر لە دەغڵو دانی خۆمان لە ڕزینو زایە بوون ڕزگار بکەم).

هەردووکاری (کەڵکم وەرگرت، توانیم) ڕوودانی کارێك نیشان دەدەن کە بەتەواوی لە دەمی ڕابوردوودا ڕووی داوەو کۆتایی هاتووە، ئەم جۆرەش ناو دەنێین (ڕابوردووی ڕووت).

لە ڕستەی بەهار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو ( بوو بوو)، بەڵام بەفر ئارەقیشی نەدەکرد) کارەکانی (گەرم ببوو، ئارەقیشی نەدەکرد) دووکاری ڕابوردوون، بەڵام لە ڕووی دەمی ڕوودانیان لە ڕابوردوو جیاوازییان هەیە، کاری (گەرم ببوو- گەرم بوو بوو) کارێکە ئێشێك

پیشان دەدا کە دەمی ڕوودانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژی بەر لەکاتی ئاخافتن، بۆیێ ناوی دەنێین (ڕابوردووی دوور)، بەلام کاری (ئارەقیشی نەدەکرد)، هەر چەندە ڕوونەدانی کارێك لە ڕابوردوودا پیشان دەدا، بەلام ڕووداانەکە یان (ڕوونەدانەکە) هەر بەردەوامە کاتێکی دیارکراو نییە کە کۆتایی بە ڕووداانەکە بهێنی، بە واتاییێکی دیکە ئیشەکە (لە ڕوودان‌و لە ڕوونەدان)دا هەر بەردەوامە ئەو جۆرە کارە بە کاری (ڕابوردووی بەردەوام) ناو دەبریێ.

لە ڕستەی (ڕۆژێك چوومە مزگەوت تەماشام کرد پیرە پیاوێك بە تەنێ لە تەنیشت سۆبە ساردوو سڕەکە هەڵکورماوە). چەند کارێکی ڕابوردوو هەیە، بەلام ئەوەی ئێمە مەبەستمان پێ کاری (هەڵکورماوە)یە، ئەو کارە ڕوودانی ئیشێك لە ڕابوردوودا دەخاتە ڕوو کە ئاسارو ئەنجامەکەی هەتا دەمێکی نزیك لەکاتی ئاخافتن هەر دەمینێ، ئەم جۆرە کارەش پێی دەگوترێ (ڕابوردووی تەواو).

## دەستوور:

**کاری ڕابوردوو: ئەوەیە کە کارێك یان ئیشێك ڕادەگەیێنێ لەکاتی ڕابوردوو ئانکۆ بۆریدا، واتە بەر لەکاتی ئاخافتن، کاری ڕابوردووش وەك باسکرا ئەم جۆرانەی هەیە:**

١. ڕابوردووی نزیك (ڕووت).

٢. ڕابوردووی دوور.

٣. ڕابوردووی بەردەوام.

### ٤. ڕابوردووی تەواو

| ز | دەمەکان | پێشگر | کار | پاشگر |
|---|---|---|---|---|
| ١ | رابوردووی نزیك | - | هات | - |
| ٢ | رابوردووی دوور | - | هات | بوو (وەکو کارێکی یاریدەدەر) |
| ٣ | رابوردووی بەردەوام | دە | هات | - |
| ٤ | رابوردووی تەواو | - | هات | وە(ووە) |

## ڕاهێنانی (١)

| | |
|---|---|
| ١. ئەز چووم | من چووم |
| توو ........... | تۆ ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٢. من گرت | من گرتم |
| تە........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوە ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |

| | |
|---|---|
| ٣. ئەز هاتیمە | من هاتووم |
| تو ........... | تۆ ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٤. من گرتیە | من گرتوومە |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوە ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا کارە ڕابووردەکان دەربهێنەو جۆرەکەیان نیشان بدە:

١. کە چووم باوکم نووستبوو.

٢. هەتا نهۆ هەڤالێ من نەهاتیە.

٣. ئازادم دیت لە پەرتوکخانەدا دەیخوێند.

٤. وێ بازنێ زێڕ کڕی.

٥. کە هاتم، ئەو نانی دەخوارد.

# ڕاهێنانی (٣)

| | |
|---|---|
| ٥. ئەڕ هاتبووم | من هاتبووم |
| تو ........... | تۆ ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٦. من گرتبوو | من گرتبووم |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوە ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |
| ٧. ئەز دهاتم | من دەهاتم |
| تۆ ........... | تو ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |

| | |
|---|---|
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٨. من دگرت | من دەمگرت |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوە ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |

## ڕاهێنانی (٤)

ڤان ڕستێن ژێری شی بکەڤە:

١. سیروانی نامە نڤیسییە.

٢. نازدارێ وانە خاند.

٣. ئازاد نووستبوو.




**مامۆستای زانیاری لە باسی ( ئاو ) گوتی:**

**(( ئاو ژێدەرو سەرچاوەی ژیانە، مرۆڤ و جانەوەرو ڕووەك بەهۆی ئاوەوە دەژین، سێ بەشی گۆی زەمین بە ئاو داپۆشراوە، ئێستا گرفتی کەمی ئاو ولاتان نیگەران دەکا، لەبەر ئەوە دەسەلاتدارانی ڤان ولاتان بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەو گرفتە چارە بکەن، لە پاشەڕۆژدا ئاڤ دەبێتە فاکتەرێکی پڕ هێز بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی لە نێوان میللەتانی جیهان، ئاو سەرچاوەی وە دەست خستنی وزەی کارەبایە، پشکا هەرە زۆری وزەی کارەبای هەرێمی کوردستان لە هەردوو بەنداوی دوکان و دەربەندیخان دهێتە بەرهەمهێنان، پاش چەند سالێکی دی ئاو جێی نەوت دەگرێ لە بەرهەمهێنانی وزە، لێ مخابن ئاوی کوردستان بە فیڕۆ دەچێت، ئەگەر کوردستان ژی خودانا بڕیارێ خۆ بایە ئەو سامانە گرنگە سوودی بۆ گەلی کورد دەبوو)).**

## خستنەڕوو:

ئەگەر بە سەرنجەوە ئەو باسەی سەرەوە بخوێنینەوە، دەبینین ژمارەیەك كاری تێدایە كە ڕوودانی كردەوەیەك نیشان دەدەن، كە لەكاتی ئاخافتن یان لە پاش كاتی ئاخافتن ڕووی دابێ، دیارە ئەو كارەی

ئیشێك دەردەخا كە لەگەڵ ئاخافتنـدا ڕووی دابـێ پێـی دەگـوترێ كـاری ڕانەبوردووی (ئێستا یان نهۆ)، ئەوەی كە ئیشێك دەردەخا لە دوای كاتی ئاخاوتن ڕووی دابێ، ئەوەیان پێی دەگوترێ كاری داهاتوو یـان (پاشـی، لەمەودوا، ئایندە).

## بۆ نموونە:

لە ڕستەی (ئاو ژێدەرو سەرچاوەی ژیانـە، مـرۆڤ و جانـەوەرو ڕووەك بەهۆی ئاوەوە دەژین).

دەبینین كاری (دەژین) كردەوەیەك نیشان دەدا كە لـەكاتی ئێـستادا ڕوو دەداتو ئەو جۆرە پێی دەگوترێ كاری ڕانەبوردوو.

بە هەمان شێوە ڕستەی ( ئێستا گرفتی كـەمیی ئـاو وڵاتـان نیگـەران دەكا) ئیشێك پیشان دەدا كە لـەكاتی ئاخافتنـدا ڕووی دابـێ بـۆیێ پێـی دەگوترێ كاری ڕانەبوردووی ئێستا یان (نهۆ).

بەڵام ئەگەر لە ڕستەی (ئاڤ دێ بیتە فاكتەرێكی پڕ هێز بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی لەنێوان میللەتانی جیهان).

وردبینەوە، دەبینین كاری (دێ بیتە) كردەوەیەك نیشان دەدا كە تـا كاتی ئاخافتن ڕووی نەداوە، بەڵكو ڕوونەدانەكەی دەكەوێتـە پـاش كـاتی قـسەكردنەكە، بـۆیێ پێـی دەگـوترێ كـاری ڕانـەبوردووی داهـاتوو یـان (پاشی).

هەروەها لە ڕستەی (پاش چەند ساڵێكی دی ئاو جێی نـەوت دەگـرێ لە بەرهەمهێنانی وزە).

کاری (دەگریّ) لە شێوەدا وەکو کارێکی ڕانەبردوودی کاتی ئێستایە، بەڵام لە واتادا بەهۆی گرێی هاوەڵکاری (پاش چەند ساڵێکی دی)یەوە، ڕوودانی ئیشێك نیشان دەدا کە دەکەوێتە پاش کاتی ئاخافتنەوە، هەر بۆیێ بەم جۆرەیان دەگوترێ کاری ڕانەبوردووی داهاتوو یان (پاشی).

## دەستوور:

**کاری ڕانەبوردوو کردەوەیێك نیشان دەدا یان لەگەڵ کاتی ئاخاوتندا ڕوو دەداتو ئەو کاتە پێی دەڵێن (ڕانەبوردوو کاتی ئێستا)، یان لەدوای ئاخافتن ڕوو دەدات کە ئەو کاتە پێی دەڵێن ڕانەبوردوو کاتی داهاتوو (پاشی)، کە لەشێوەدا هەردووکیان لە یەك دەچن، تەنیا هاوەڵکاری کات جودایان دەکاتەوە وەك:**

**دەچـــــــم بـۆ لادێ**

**ئێستا دەچـــم بۆ لادێ**

**سبەینێ دەچم بۆ لادێ**

**بـەڵام لـە شـێوە زمـانی کـوردی کرمـانجی ژووروودا نیـشانەی (دێ) دەخرێتـە پـێش کـارە ڕانەبردووەکـە، ئنجا پێشگری (بـ) لـەجیاتی (د) بەکاردێ. بۆ ئەوەی ببێتە ڕانەبردووی کاتی داهاتوو وەك:**

**ئەز نهۆ دچم بۆ دهۆکێ**

**ئەز سبەهی دێ بچم بۆ دهۆکێ.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم نووسینە بخوێنەوەو ئنجا هەرچی کاری ڕابوردوو هەیە بیانکە بە ڕانەبوردوو:

(( هاوین بوو، هەوا ئەوەندە گەرم ببوو کەس نەیدەتوانی تا ئێوارەیەکی درەنگ دەربکەوێ، میوەی هاوینە پێگەیشتبوو، بەلاّم گەرما بەشێکی زۆری درەختی میوەی زەرەرمەند کردبوو، ڕۆژێکیان برادەران بڕیاریان دا بچین بۆ هاڤینگەها سوارەتووکەی، بە ئوتومبێل چووین، ئاوو هەوای ئەوێ فێنك بوو، تا ئێوارە ماینەوە. مە ڕۆژەکا زۆر خۆش بڕێ کرد دوور لە گەرما، ئاوی ساردی ئەو هاڤینگەهە دەروونی هەموومانی فێنك کردەوە)).

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کارە ڕانەبوردووانە لە ڕستە بەکاربێنە:

دەخوێنم- دنڤیسین- ئەز دخوینم- هوین دچن- دەکێلێ(ێت)- دروست دەکەن.

## ڕاهێنانی (٣)

شیکردنەوە:

٣. کۆتری سپی جوانە.

کۆتر: ناوە، گشتییە، نیهادە.

ی: ئامرازی دانەپاڵە.

سپی: هاوەڵناوە، تەواوکەری ناوی (کۆتر)ە.

جوان: هاوەڵناوی چۆنیەتییە، تەواوکەری کاری (ە)ی ناتەواوە.

٤. ئەم ڕستانە شی بکەوە

أ- پیاوی ئازا خۆشەویستە.

ب-دەرەبەگی خوێنمژ نەیارە.

## ج. كاری داخوازی

### لەوانەی زانیارییدا، مامۆستامان گوتی:

(( خوێندكارینە بۆ ئەوەی لەشتان دروست بێ، پتەوو بەهێزبن هەموو شەوێك زوو بنوون (بنڤن)، بەیانیان ژی زوو لە خەو ڕابن، دەم و چاوتان بە ئاوو سابوون بشۆن، ئنجا نانی بەیانی بخۆن، جلك و بەرگتان لەبەر بكەن و بڕۆن بۆ قوتابخانە.

ئەی قوتابی، لە كاتی دیاری كراودا، لە پۆلەكەت ئامادەبە، گوێ لە مامۆستا بگرە، دگەل هەڤالێن خۆ نە ئاخڤە، تەماشای ئەملاو ئەولا مەكە، كە تەواو بووی یەكسەر هەڕە مال، پشتی پشوودان و حەسانەوە وانەكانت بخوێنە، ئەركی ماڵەوە بنڤیسە، كات بە فیرۆ مەدە، هەڤالینیێ دگەل مرۆڤێن خراپ نەكە)).

### خستنەڕوو:

دیارە قوتابی و خوێندكاری ژیرو هۆشمەند دەبێ ئامۆژگاری مامۆستایان لەگوێ بگرێ بۆیێ مامۆستای زانیاری رووی لە قوتابییانی كردو هەندێك ئامۆژگاری كردن، بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن.

مامۆستای زانیاری جارێك روو لە هەموو خوێندكاران دەكاو پێیان دەڵێ:

١. هەموو شەوێك زوو بنوون (بنڤن)، بەیانیان ژی زوو لە خەو ڕابن.

جارێكیش ڕوو لە تاكە تاكەیان دەكاو پێیان دەڵێ:

٢. ئەی قوتابی، لەکاتی دیاری کراو لە پۆلەکەت ئامادەبە گوێ لە مامۆستا بگرە.

لە ڕستەی یەکەمدا مامۆستا داوا لە خوێندکاران دەکا کارێك لە دوای ئاخافتن ئەنجام بدەن‌و کارەکەی خستۆتە شێوەی داواکردن یان داخوازی یان فەرمان پێکردن، دیارە خوێندکارانیش کە کەسی دووەمی کۆ)ن داخوازییەکەی مامۆستایان جێ بەجێ دەکەن.

لە ڕستەی دووەمیش بە هەمان شێوە ڕوو لە تاکە قوتابی دەکات کە (کەسی دووەمی تاکە)و داوای لێ دەکا کە لەکاتی دیاری کراودا لە پۆل ئامادە بێ‌و گوێ لە مامۆستا بگرێ، دیارە ئەنجامدانی ئەو کارەش لەلایەن قوتابییەکە دەکەوێتە پاش ئاخافتنەکەی مامۆستاو هەر لەبەر ئەوەش ئەم جۆرە کارە پێی دەگوترێ کاری داخوازی.

دیسان لە هەردوو ڕستەی (( دگەل هەڤالێن خۆ نە ئاخڤە ))و (تەماشای ئەملاو ئەولا مەکە)، مامۆستا داوا لە قوتابی دەکا کە کارەکە ئەنجام نەدا چونکە ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە بە خراپە دەشکێتەوە سەر خوێندکار، ئەو جۆرە کارانە ژی هەر کارێت داخوازین بەلام لە دۆخی نەرێدان.

کە بە ئامرازی (مە)و (نە) دروست دەکرێ.

## دەستوور:

**کاری داخوازی، کارێکە داخوازی کردنی یان نەکردنی ئیشێکی پێ لە کەسی دووەمی (تاكو کۆ) دەکرێ، کە یەکسەر لەدوای ئاخافتن ئەنجام دەدرێ.**

**کاری داخوازی بەنیشانەی (بـ) دەست پێدەکاو بە بزوێنی (ە) بۆ تاكو بە نەبزوێنی (ن) بۆ کۆ دویماهی دێت، کە ڕەنگبێ هەردووکیان لەم شوێنەدا بە جێناو دابنرێن، وەك: بنووسە- بنووسن.**

**بەڵام لە هەندێك کاردا کە ڕەگەکانیان کۆتاییان دێ بە بزوێنی وەکو (ۆ- وو- ێ- ی).**

**لە کەسی دووەمی تاك دا بزوێنی (ە) دەرناکەوێ وەك: (بخۆ- بڕۆ- بشۆ- بنوو- بدروو- بلێ- دابنێ- بژی- بگری)**

## ڕاهێنانی (١)

کاری ئەم ڕستانە لە دۆخی (ئەرێ)وە بگۆڕە بە (نەرێ):

١. شەو درەنگ بخەوە.

٢. بچن بۆ مەلە کردن.

٣. کەلوپەل بە گران بفرۆشە.

٤. یارمەتی ئەم پیاوە بدە.

٥. نان زۆر بخۆن.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کارانە جارێك بە (مە)و جارێك بە (نە) بخە دۆخی نەرێنی.

بنڤە- بدروون- پیَ بکەنە- سەر بکەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێرە هۆنراوانە هەرچی کاری داخوازی هەیە دەستنیشانی بکەو بینووسەوە:

١. لە خەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە.
هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزلو هونەرتانە

٢. ئەی باڵندەی هەستم بە گوڕ
بفڕە بۆ ناو بلێسەو گڕ.

٣. ئەی کچیَ ڕابە بخوێنە داتو سەربەست هەر بژی
زوو ژ خەوتو سەر هلینە بەس بمینە بیَ مژی.

### لێکدانەوەی وشەکان:

سەرهلینە : سەر بەرز بکەوە

بیَ مژی : بیَ مێشك

# ئەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی

**پێشەکییەکی مێژوویی:** کوردەکان بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام خاوەنی ئەلفبێیەکی تایبەتی خۆیان بوون‌و بە قسەی زانای بەناوبانگی کورد مامۆستا (بلەچ شێرکۆ) کوردەکان لە پێش ئیسلامدا لە چەپەوە بۆ ڕاست‌و بە ئەلفبێیەکی سەربەخۆی خۆیان زمانەکەی خۆیانیان دەنووسی بەڵام لە پاش ئەوەی ئایینی ئیسلام لەناو کوردانـدا بڵاوبوویەوە، کوردەکان وازیان لەو ئەلفبێیە تایبەتەی خۆیان هێناو کەوتنە سەر نووسین بە پیتی عەرەبی، زۆریش لە مێژوو نووسان لەو باوەڕەدان کە کوردەکان بە ۲۸۰۰ ساڵ پێش زایین خاوەنی ئەلفبێی تایبەتی خۆیان بوون، بەڵام دوای موسڵمان بوونیان وازیان لە نووسین بە زمانەکەی خۆیان هێناو پەنایان بردە بەر زمانەکانی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکییەوە، بەتایبەتی کە زمانی عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆزو دوو زمانەکەی تریش زمانی شاهەنشاو سوڵتانەکان بوون، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەولاو لەملادا کوردەکان جاروبار نووسینی ئەدەبی‌و ئایینی و تەنانەت زمانەوانیشیان بە کوردی بەڵام بە ئەلفبێی عەرەبی نووسیوە، باشترین نموونەش هۆنراوەکانی بابەتایەری هەمەدانی‌و عەلی حەریری‌و فەقێی تەیران‌و بێسارانی‌و ئەوانی تر بوو.

زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسەکان لەبارەی زمان‌و نووسینی کوردییەوە شتیان نووسیوە، قەشە (گارزۆنی) ئیتالیایی لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەوە دێت،

ئەو قەشەیە لە ساڵی ١٧٨٧ز کتێبێکی لەبارەی ئەلفبێی کوردییەوە لە چاپ دا، لە پاش ئەویش چەند ڕۆژهەلاتیناسێکی تر کاری لەم جۆرەیان کردووە، وەکو ئۆگست چاپا کە فەرهەنگێکی کوردی- فەرەنسی بە خەتی فارسی لە ساڵی ١٨٧٩دا لە چاپدا.

گرنگترین کاری ئەم بوارە کتێبەکەی (یوسف زیائەدین) بوو کە لە ١٨٩٢ز نووسراوە، پێش ئەویش مەلا مەحمودی بایەزیدی لە ساڵانی ١٨٥٨- ١٨٥٩ ئەلفبێیەکی بە پیتی عەرەبی بۆ نووسینی زمانی کوردی دانا، لەو نوسراوەدا مەلا مەحموود هەوڵی داوە شێوەی هەندێك پیت دروست بکات کە لە عەرەبیدا نین وەك پ، چ، گ، ڤ، ژ... هتد.

یەکەم پەرتووکی ئەلفبێ لە ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستانبول دەرچووە بەناوی (ئەلفبای کرمانجی). هەر لەم بوارەدا کۆمەڵەی (هیڤی) کە لەساڵی (١٩١٢) لە ئەستانبول دامەزرا، ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی ئەلفبێی کوردی بە پیتی عەرەبی، ئەو کۆمەڵەیە دوو گۆڤاری بەناوەکانی (ڕۆژی کورد)و (هەتاوی کورد) دەرچوواند، هەر لەسەر لاپەڕەکانی ئەم دوو گۆڤارەدا بانگەشەی ئەوە درا کە ئەلفبێی کوردی بە پیتی عەرەبی بگۆڕێت بۆ پیتی لاتینی چونکە ئەلفبێ عەرەبییەکە بە کەلکی نووسینی زمانی کوردی نایێت.

لە کوردستانی باشووریشدا، سەرەتا ڕۆشنبیرە کوردەکان ئەوەندەی گرنگییان بە کێشە سیاسییەکان دەدا، ئەوەندە بەلای مەسەلەی ئەلفبێی کوردییەوە نەدەچوون، بەڵام ئینگلیزەکان لە ساڵانی بیستی سەدەی نۆزدەم هانی ڕۆشنبیرانیان دا تا ئاورێك لە مەسەلەی ڕۆشنبیری

کوردی بدەنەوە، لەساڵی ١٩١٨ مێجەرسۆن ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە بەغدا دەرکرد، کە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە پێشخستنی زمان‌و نووسینی کوردی، دوای ساڵی ١٩٢٥ چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێك دەرچوون کە گرنگیان بە ئەلفبێی کوردی دەداو ڕووناکبیری وەك تۆفیق وەهبی‌و ئیسماعیل حەقی شاوێس تیایاندا دەنووسی.

هەر لەم بوارەدا، بیرۆکەی گۆڕینی پیتە عەرەبییەکان بە پیتە لاتینییەکان لەناو کوردانەدا پەیدابوو، کۆمەڵەی هیڤی هەر لە ساڵی ١٩١٣دا ڕۆڵێکی سەرەکی لەم مەسەلەیەدا دەگێڕا، هەروەها مێجەرسۆنی ئینگلیزیش هەر لەو ساڵەدا واتە لە ١٩١٣ نامیلکەیەکی لەبارەی ئەلفبێی کوردی‌و هەندێ مەسەلەی ڕێزمانی دانا، ئینگلیزەکان پێیان خۆش بوو کورد ئەلفبێی لاتینی بەکاربهێنێت، بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە شکستیان خوارد.

دوا جار هەوڵەکانی میرجەلادەت بەدرخان سەریان گرت‌و ئەو زانایە ئەلفبێیەکی لاتینی دانا کە لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا بگونجێت‌و لە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاوی کردەوەو پاشان ژمارەکانی گۆڤاری (هاوار)ی لە دیمەشق پێ بە چاپ گەیاند. میر جەلادەت تا مردیش هەر لەم بوارەدا کاری کرد.

## ئەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی:

دوای ئەم پێشەکییە مێژووییە، ئێستا دێینە سەر باسکردنی ئـەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی:

پیتەکانی ئەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی دەکرێن بە دوو گرووپ:

أ- گرووپی یەکەم پیتە بزوێنەکانن، کە ژمارەیان (٨) هەشت پیتە.

| ز | پیتە لاتینییەکان | عەرەبی | ناوی پیتەکە | نموونە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | a- A | ا | ئەلف | Aw, - mar- Agir |
| ٢ | e- E | ـە (ە) | ئە | Pel- Ew- Derman |
| ٣ | u- U | و | واوی کورت | Kurd- Gul |
| ٤ | û- Û | وو | واوی درێژ | Dûr- Sûr |
| ٥ | o- O | ۆ | واوی کراوە | Do- Zor |
| ٦ | î- Î | یی | یای درێژ | Yarî- Sîr |
| ٧ | ê- Ê | ێ | یای کراوە | Hêlka- Ême |
| ٨ | i- I | بزرۆکە | بزرۆکە | Dil- Bizin |

ب- گرووپی دووەم پیتە نەبزوێنەکانن کە ژمارەیان (٢٨) پیتە:

| ز | پیتە لاتینییەکان | عەرەبی | ناوی پیتەکە | نموونە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | b- B | ب | بێ | Baran- Kebab |
| ٢ | p- P | پ | پێ | Par- Pepula |
| ٣ | t- T | ت | تێ | To- Pertûk |
| ٤ | c- C | ج | جیم | Tac- Cacim |
| ٥ | ç- Ç | چ | چیم | Çaw- Çêl |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ĥewt- Ĥelwa | حێ | ح | ĥ- Ĥ | ٦ |
| Xew- Xurma | خێ | خ | x- X | ٧ |
| Dar- dest | دال | د | d- D | ٨ |
| Beraz- Ker | رێ | ر | r- R | ٩ |
| Ŕûbar- Ŕeng | ڕای قەڵەو | ڕ | ŕ- Ŕ | ١٠ |
| Zê- Zeng | زێ | ز | z- Z | ١١ |
| Jin- Jeng | ژێ | ژ | j- J | ١٢ |
| Sêw- Mast | سین | س | s- S | ١٣ |
| Şêr- Şew | شین | ش | ş- Ş | ١٤ |
| E'lî, A' dil, u'mer, le'lî, ni'met | دەخرێتە سەر نەبزوێنەکە ع عەین | | | ١٥ |
| X̂ardan- X̂em | غەین | غ | x̂ – X̂ | ١٦ |
| Kef- Fênik | فێ | ف | f- F | ١٧ |
| Mirov- Çav | ڤێ | ڤ | v- V | ١٨ |
| Qaz- Boq | قاف | ق | q- Q | ١٩ |
| Kew- Pak | کاف | ك | k- K | ٢٠ |
| Gurg- Dang | گاف | گ | g- G | ٢١ |
| Mil- mel | لام | ل | l- L | ٢٢ |
| Maĺ- Diĺ | لامی قەڵەو | ڵ | ĺ- Ĺ | ٢٣ |
| Dem- Masî | میم | م | m- M | ٢٤ |
| Nok- min | نوون | ن | n- N | ٢٥ |
| Hewir- Hîwa | هێ | ه | h- H | ٢٦ |
| Wane- Aw | واوی نەبزوێن | و | w- W | ٢٧ |
| Yarî- heyv | یای نەبزوێن | ی | y- Y | ٢٨ |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم پەیڤانە بە پیتی لاتینی بنووسە:

چیا، کوردستان، چەم، جوانی، ڕۆژگار، ئازادی، گۆران، هەندرێن، دهۆك، زاخۆ.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە بە پیتی لاتینی بنووسەوە.

١. زستانی کوردستان زۆر ساردە.

٢. ئازادی کوڕێ وی ل زانکۆیا دهۆکی دخوینیت.

٣. مەلایێ جزیری هۆزانڤانەکێ بناڤ و دەنگە.

٤. سلێمانی پایتەختی ڕۆشنبیری کوردستانە.

٥. کەرکووك بەشێکە لە هەرێمی کوردستان.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم پارچە نووسینە لە ئەلفبێی عەرەبی بگۆڕە بۆ سەر ئەلفبێی لاتینی:

(لە پاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ هەرێمی کوردستان گۆڕانێکی زۆری بەخۆوە دیت، ئەڤ هەرێمە لەچوار پارێزگا پێکدێت، هەولێرو سلێمانیو کەرکووكو دهۆك، چەند قەزاییێکی تریش هەن کە بەشێکن لەم هەرێمە وەك خانەقینو شەنگارو بەدرە، کۆمەڵی کوردەواری لە گەلێك لایەنەوە پێشکەوتووە، لەبەر ئەوە پێویستە ئەزموونی دیموکراتی کوردستان بپارێزین).

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم هۆنراوەیە لە لاتینییەوە بگۆڕە بۆ سەر ئەلفبێی عەرەبی:

## *Pêşmerge*

**ŕeng û dengê azadiyê**
**Xeml û Xweşîya çelngiyê**
**Bazê çiya û zinaran**
**Kulîlka deştû zozanan**
**Ŕonîya berbangan**
**Sorîya asoyan**
**Pêşmerge me**
**Çavkanî û lehîya azadîme**
**Dadikevim ji Çiya û geliyan**
**Digeŕim li deştû newalan**
**Gund û bajar warên minin**
**Azadî û serxwebûn armanca minin**

(Serdar Roşan)

تێبینی: مامۆستا دەتوانێت نموونەی زیاتر لەم بارەیەوە بە قوتابیان و خوێندکارەکانی بدات.

# بەشی ئەدەب

١. قانیع
٢. جگەرخوێن
٣. بەختیار زێوەر
٤. سەلام
٥. ئەحمەد موختار جاف
٦. هێمن
٧. ئەحمەدێ نالبەند
٨. مەلا ئەنورێ مایی
٩. عەبدولواحید نوری
١٠. ئیبراهیم ئەحمەد ( بلە ).

# قانیع

قانع ناوی موحەمەدە کوڕی شێخ عەبدولقادری شێخ سەعیدی دۆڵاشی مەریوانە. لە پازدەی ئەیلوولی ساڵی (١٨٩٨)ز لە گوندی ڕیشێن لە دایك بووە، قانع لە تەمەنی چل ڕۆژی دابوو باوکی کۆچی دوایی کردووە، لە تەمەنی دوو ساڵان دایکیشی کۆچی دوایی کردووە، قانع هەر لە منداڵییەوە تووشی دەربەدەری بووە، هەر لەو کاتەوە تێکەڵ بە ئێش و ئازارو برسییەتی نەتەوەکەی بووە. بەهۆی خزمێکییەوە دەچێتە حوجرەی مزگەوت و دەست بە خوێندن دەکا. بەناو دێهاتەکانی مەریوان دا بۆ خوێندن چەرخەیەکی تەواوی داوە، پاشان کەوتە گەڕان بە شارەکانی کوردستان بۆ خوێندن. (سەقزو بانەو سابلاخ و بۆکان و شنۆو کۆیەو هەولێرو کەرکووك و سولەیمانی و هەڵەبجەو پێنجوێن و سنەو بیارە)و چەند جێگایەکی تر گەڕاوە.

ناسراوییەکی تەواوی لەگەڵ بنەماڵە ئایینییەکانی کوردستاندا هەبووە. بەتایبەتی لەگەڵ (شێخ مەحموودی نەمر). هەروەها لە خزمەت مەلای گەورەدا لە کۆیە خوێندوویەتی. بەهەر جۆرێك بوو خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە، بەڵام حەزی لە مەلایەتی نەکردووە. لە کۆماری مەهاباد کاربەدەستی پەروەردەکردن بووە. تا خۆی لە ژیاندا بوو دیوانەکانی (گوڵاڵەی مەریوان، باخچەی کوردستان، چوار باخی پێنجوێن، شاخی هەورامان، دەشتی گەرمیان)ی بڵاوکراوەتەوە. لە ١٩٦٥/٥/٧ز دا لە گوندی (لەنگەدێ) لە ناوچەی شلێر کۆچی دوایی

کردووەو هەر لەوێ نێژراوە. پاش مردنیشی لە ساڵی (١٩٧٠)ز (پاش مەرگەی قانع) بڵاوکراوەتەوە.

لە ساڵی (١٩٧٤)ز بە شێك لە شیعرەکانی بڵاوکراوەتەوە بەناوی (نامەی قانع). هەروەها لە ساڵی (١٩٧٩) شیعرەکانی بڵاوکراوەتەوە بە ناوی (دیوانی قانع)، قانع لە ژیانیدا کوێرەوەری‌و دەردی زۆر دیوە وەکو زۆربەی شاعیرانی تری کورد.

قانع لە سەرەتای شاعیرییەتیدا بە فارسی هۆنراوەی گوتووە، چونکە زمانی فارسی لەو سەردەمەدا باو بووە، لە پاش هەست کردنی بە بیری کوردایەتی پیرۆز دەستی کردووە بە هۆنراوە گوتن بەزمانی پاکی کوردی، قانع بە شاعیری وریایی لادێی کورد بەناو بانگە، شیعرەکانی خۆماڵی‌و ڕەوانن، لەسەرەتای هەڵگیرساندنی شەڕی دووەمی جیهان قانع تێکەڵ بە ڕێبازی ئەدەبیی شۆڕشگێڕانە بووە. هۆنراوەکانی لە ڕووی مەبەستەوە سێ بابەتی گرتووەتەوە (دڵداری، کۆمەڵایەتی، نیشتمانپەروەری‌و نەتەوایەتی). قانع لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٣)ز بەهۆی باری ئاڵۆزی ناوچەکەوە لەگەڵ دانیشتوانی چەند دێ یەکدا ڕەو دەکەن‌و دەچنە ئەو بەری سنوورەوە. هەر ئەو شەوە دەیگرن‌و دەیبەن بۆ بەندیخانەی (قەجەر) لە تاران‌و ماوەیەك لە بەندیخانەدا دەی هێڵنەوە، لە کاتی ئەو بەندییەدا نەخۆشییەکەی زۆری بۆ دێنی‌و هیوا بڕاوی ژیان دەبێت‌و بەم جۆرە باسی بەندیخانەکەی دەکات:

١. ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە

ئەم کەلەبچە مەرھەمی زامی دڵی دێوانەیە

٢. زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرِزڕەی زنجیر ئەکەم

سەیری ئەم زنجیرە کەن وەك زێوەری شاهانەیە

٣. بووکی ئازادیم ئەوێ، خوێنم خەنەس بۆ دەستو پێ

ئەڵقە ئەڵقەی پێوەنم وەك پلپڵەو لەرزانەیە

٤. گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بەدیلی لاڵ ئەبم

باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابی خانەیە

٥. گرتنو لێدانو کوشتن عاملی ئازادییە

تۆپو شەستیرو کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە

٦. بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ

قوڕ بەسەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە

٧. گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم

نۆکەریو سەردانەواندن کاری نامەردانەیە

٨. چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا

میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە

٩. چەکی شۆڕشگێڕی من نووسینو بیرو باوەڕە

ڕاپەڕینە، هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانەیە

١٠. "قانع"م ئەمڕۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم

سەد هەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

(حەوت دێری هۆنراوەکە بۆ لەبەرکردنە لەسەرەتاوە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| کونجی بەندیخانەیە | : | سوچێکی تاریك لە بەندیخانە |
| زێوەری شاهانەیە | : | ئارایش‌و ڕازاندنەوەی مەلیکانەیە. |
| خەنەس | : | خەنەیە |
| پێوەنم | : | پێوەندم، کۆت‌و زنجیرێکە دەخرێتە پێی مرۆڤ |
| پلْپلە | : | پارچە زێڕ یا زیوی بچووك کە بەخشڵێکەوە بەندکرابێ. |
| لەرزانە | : | جۆرە خشڵ‌و زێڕێکە بۆ سەری ژن. |

# جگەر خوێن

ناڤێ وی (شێخ مووسا کوڕێ کوڕێ حەسەنی کوڕێ محەمەد)یە. لە ساڵی ١٩٠٣ لە گوندی (حەسار) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای بارژێری (حەسەنکێف) لە کوردستانی باکوور لەدایك بووە.

جگەر خوین خۆی دبێژیت:

**سالا هەزارو نەهسەدو سێ ئەز هاتم دنیایێ**
**بناڤێ سولتان شێخ مووس ئەز چێ بوومە ژ دایێ**
**هەتا بووم سێزدە ساڵی لگوندێ مەی هەساریێ**
**ژینا خوە من بۆراند پاشی ژوێ مەدا ڕێ**

جگەر خوین هێشتا بچووك بوو بابی دەمرێ، لەگەڵ دایكو خوشكو براێن خۆ بەرەو شاری (ئاموودە) چوون، لەوێ دایکیشی دەمرێت. لە ساڵی ١٩١٧ دەچێتە بەر خوێندنو لە ١٩٣٢ تەواوی دەکا، ماوەیێك مەلایەتی کرد، پاشان وازی لێ هێنا. دگەل کۆمەلەکا جوتیارێن کورد دچیتە پارچا دن یا جزیرێ لە سوریاو دوو گوندان ئاڤادکەن بەناوی (چێلەك)و (جەهەننەم).

جگەر خوین پشکداری لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کردیە، تێکشکاندنی شۆڕشەکە بە ئاواو شێوەییێکی دڕندانە کارێکی مەزنی کردە سەر هەستی نەتەوایەتی شێخ مووسو برینێکی گەورەی لە دڵی وی دا پەیدا کرد، لەوڕا ناسناڤێ خۆ کردە جگەرخوین. پاش ئەم کارەساتە هەموو شیعری خۆی بۆ کوردستان تەرخان کرد.

خامەی خۆی کرد بووە خەنجەر بۆ سینگێ دوژمنو زنگ بۆ هوشیارکردنی میللەت:

بەسە میللەت لتە شەرمە — هەتتا کەنگی دخەو دابی؟
دبن دەستێن نەیاران دە — هەژارو دیلو کۆلانی

پاش شۆڕشی ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ دهێتە عیراقو ماوەیێك لە ئێزگەی کوردی کار دەکات، هەیا مەکیش لە زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی ئاداب- بەشی کوردی- دەبێتە مامۆستا.

زۆربەی هەڵبەستێن وی دەربارەی خەباتی نەتەوایەتیو خەباتی جوتیاری کوردە. هەر لەم ڕێگایە گەلێك گرتنو بەندییو ئازارو ئەشکەنجەی دیوە. لە ١٩٨٤/١٠/٢٢ لە (ستۆکهۆڵم)ی پایتەختی سوید دڵی مەزنی ژ لێدانێ دەوەستیتو لە باژێری (قامشلۆ) لە کوردستانی سوریا دهێتە ڤەشارتن (ناشتن).

**بەرهەمەکانی:**

١. هەڵبەست: أ- بریسکو پێتی ب- سەورا ئازادی ج- کیمە ئەز
د- ڕۆناك هـ- زەند ئاڤێستا و- شەفەق ز- هیڤی

٢. چیرۆك: أ- جیمو گول پەری ب- ڕەشۆیێ داری ج- سالارو میدیا

٣. زمانو ڕێزمان:
أ- گۆتنێن پێشیان ب- ئاواو دەستورا زمانێ کوردی
ج- فەرهەنگا کوردی بەرگێ (١- ٢)

**٤. چەندین بەرهەمی تری نووسیبو، پاش مردنی چاپ کران وەك:**

**أ- ئاشتی (هەلبەست) ب- تاریخا کوردستان بەرگێ (١- ٢)**

**ج- فۆلکلۆری کوردی د- ژینە نیگەریا من**

**هـ - نڤیسارەك لەسەر دیباجا ئەحمەدێ خانی.**

| | | |
|---|---|---|
| ژینا خوە من بۆراند | : | ژیانم بەسەر برد |
| ئەز چێ بوومە ژدایێ | : | لەدایك بووم |
| پارچا دن یا جزیرێ | : | پارچە یا بەشەکەی تری جزیرە |
| لەورا | : | لەبەر ئەوە، بۆیێ، لەبەرهەندێ |
| ناسناڤ | : | نازناو. |

## شام شەكرە، وەلات شیرنترە

(جگەرخوین)

١. وەلاتێ من تویی بووكا جیهانی

هەمی باغو بەهەشتو مێرگو كانی

٢. شەپالو شەنگو شۆخو نازو گەوری

گەلەك شیرینو ڕندو پڕ جوانی

٣. سەرێ تاجا سەلاحەدینێ كوردی

ئەنی ڕۆژە دبرجا ئاسمانی

٤. دوو بورهێن تە كڤانێ ڕۆستەمێ زال

دوو زولفێن تە ژتیرێن قەهرەمانی

٥. ڕوویێ تە ئاگرێ زەردەشتو مەزدەك

ژتە هێستر شەرابا كامیرانی

٦. دوو چاڤێن تە وەكی دەریایێ هورمز

كەپوو ئەلماسە كارێ مووشو وانی

٧. دوو لێڤێن تە كتێبا حاجی قادر

زمانێ تە ژ بەندا شێخێ خانی

٨. سەرو پا زەندو بازن تەڤ حەنینە

هەمی سۆرن ژ ڕەنگێ ئەرخەوانی

٩. جگەر خوینە كوڕێ تەر هەر دنالی

ژبەر ژانا نەزانییو خەزانی.

** ** **

لەسەرەتاوە حەفت دێڕی بۆ لەبەركردنە

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| شەپال | : | جوان، ڕند |
| بووکا جیهانی | : | بووکی جیهانی |
| پڕ جوانی | : | زۆر جوانی |
| ئەنی | : | هەنیە، نێو چاوان |
| دوو بورهێن تە | : | دوو برۆی تۆ |
| کڤان | : | کەوان |
| دوو زولفێن تە | : | هەردوو زولفەکانت |
| ژتە هێستر | : | فرمێسکەکانت |
| دوو لێڤێن تە | : | هەردوو لێوانت |
| زمانێ تە ژ بەندا<br>شێخی خانی | : | زمانت لە بەندی شێخی خانییە |
| تەڤ حەنینە | : | هەموو خەناوی یە |
| خەزانی | : | هەژاری |

# بەختیار زێوەرە

ناوی ڕاستەقینەی (فایەق)ە کوڕی شاعیری بەناوبانگی کورد زێوەرە لە ساڵی (١٩٠٨)ز لە شاری سولەیمانی لەدایك بووە. سەرەتا وەکو هەموو منداڵانی ئەو سەردەمە لە حوجرەی مزگەوتدا خوێندوویەتی پاشان چووەتە قوتابخانەو پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواو کردووە، ئینجا لە بەغدا دەورەیەکی (برین پێچیی ئاژەڵان)ی دیوەو چووەتە سەر ئەو ئیشە. لە ماوەی فەرمانبەریدا ناوچەکانی سولەیمانی گەڕاوەو ماوەیەکیش لە پردێ بووە.

لە ساڵی ١٩٤٦ز کاتێ قوتابخانەی ناوەندی شەو لە سولەیمانی کرایەوە، فایق بێ گوێ دانە تەمەن و ئەرکی ژیان و پلەی کۆمەڵایەتی و شاعیرانەی بووە بە قوتابی و لە ساڵی (١٩٤٨)ز پۆلی سێیەمی تەواوکردووە. هەر لەو ساڵەدا بەهۆی کۆچی دوایی باوکییەوە تەواو بە دەست نەخۆشییەکەوە کە زووتر سەرەتای دیار بوو، پەریشان و سەرگەردان بووە، تا لە ١٩٥٢/١٢/٣١ز کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی گردی (جۆگا) لە سولەیمانی لە تەنیشت باوکییەوە نێژراوە.

لە گەرمەی کێشەی سەختی ژیاندا خۆی ناو دەنێ (سەرکەوتوو) لە کۆڕی نەخۆشی و زامداری و کلۆڵی دا بەر چاوی تاریك نابێ و هیوای نابڕێ، ئازار بەسەرچاوەی دروست بوونی ژیانی بەختیارو سەرکەوتن دەزانێ، پاشان ناوی خۆی دەنێ (بەختیار) بەختیار زێوەر بە تەواوی پەیڕەوی زێوەری باوکی کردووە، بەڵکو قوتابییەکی سەرکەوتوو پێشکەوتووی ئەوە لەپەیڕەوی زانست پەروەری دا. لەژێر باڵی ڕەشیی

دواکەوتوویی‌و نەزانی‌و چەپۆکی داگیرکەردا شاعیری زانست پەروەر خوێندن‌و فێربوون‌و زانست بە چەکی ڕزگار بوون دادەنێ.

هۆنراوەکانی زیاتر نیشتمانپەروەری‌و دڵدارین، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی کۆمەڵێك سروودی جوان‌و بەناوبانگە وەکو:

(چەند شیرینە لام، برایینە لەخەو هەستن، گۆیژە....)

بناغەی خوێندەواری‌و پێگەیشتنی شاعیرانەی هەر ئەوە نییە کە لەخوێندنی حوجرەو قوتابخانەو کۆڕی گشتیی ژیان پێك هاتبێ بەڵکو[1].

سەرەتاو بناغە پتەوەکەی چەش بوونە بە بیستن‌و لێکدانەوەی شیعری کلاسیکی کوردی‌و فارسی.

**ئەمەش نموونەیەکە لە هۆنراوەی بەختیار زێوەر:**

## گوڵی سەربەستی

**گوڵێك شیرینتر لە خونچەی بەهار**

**نازکتر، جوانتر، لە شەوبۆی نازدار**

**گەشتر لە دیدەی وەنەوشەی نزار**

**گوڵێکە ناوی گوڵی سەربەستی**

**مەردە ئەو کەلەی بکاتە دەستی**

** **

**گوڵی سەربەستی ئەی هێزی گیانم**

**ڕۆشن کەرەوەی ڕێگەی ژیانـــــم**

---

(١) ژیانی بەختیار زێوەر لە کتێبی ژیان‌و بەرهەمی شاعیران وەرگێراوە، دانانی د. عیزەددین مستەفا ڕەسول.

تۆم نەبێ، من خۆم بە هیچ نازانم

تۆم نەبێ هەرگیز ناحەسێمـــەوە

بێ بۆنی خۆشت نابوژێمــــــەوە

** **

با تەنیا هەر تۆ شاگوڵی من بـــی

سەرچاوەی سۆزی بە کوڵی من بی

تۆ تاقە یاری پڕ دڵی من بــــــی

شیعرت پیا هەڵدەم بە زوبانی خۆم

بڵێم دەمێکە بە دڵ شەیدای تـــۆم

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| سەربەستی | : | ئازادی |
| شیرینتر | : | جوانتر |
| شەوبۆ | : | جۆرە گوڵێکە بە شەو بۆنی خۆشە |
| دیدە | : | چاو، چاڤ |
| وەنەوشە | : | جۆرە گوڵێکی دەشتییەو گوڵەکانی بچکۆڵەن |
| نزار | : | دارستانی چڕ |
| مەرد | : | پیاوە (ئازایە) |
| ناحەسێمەوە | : | ئۆقرە ناگرم، ئارام ناگرم، پشوو نادەم |
| تاقە | : | تاکە، ئێك |
| شەیدا | : | گێرۆدە |
| هۆز | : | خێڵ- عەشیرەت |
| نابوژێمەوە | : | ناگەشبم، ناگەشێمەوە |
| یار | : | دۆست، هەڤاڵ، هاوڕێ |

# سەلام

## ١٨٩٢- ١٩٥٩ز

سەلام کوڕی شێخ ئەحمەدی عازەبانییە، لە ساڵی ١٨٩٢ز لە گوندی (عازەبان)ی ناوچەی وارماوەی سەر بە قەزای هەڵەبجە لەدایك بووە. زۆر ئارەزووی لە خوێندن بووە، لە تەمەنی چوار ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، قورئانو فارسی خوێندووە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا بووە کە باوکی کۆچی دوایی کرد. ئاگاداری ڕووداوەکانی یەکەم شۆڕشی (شێخ مەحمودی حەفید) بووە لە ١٩١٩. پاش بەدیل گرتنی شێخی نەمر، بووە پۆلیس، تا ساڵی ١٩٢٢کە (شێخ مەحموود) گەڕایەوەو بوو بە (مەلیکی کوردستان)، ئەمیش دەبێ بە بەڕێوەبەری (ئەوراقی عەسکەری). هەر لەو ساڵەدا دیسان بەشداری شۆڕشی دووەمی (شێخ مەحموود) دەبێ، بەڵام ماوەییێك لەلایەن شێخەوە دەسگیر دەکرێو دەچێتەوە عازەبان. لە وەزیفەدا زۆر شوێنو جێی کردووە، وەك وارماوە، هەڵەبجە، سلێمانیو تەنانەت بەسرەو بەغداو حیللەو شوێنانی تریش. لە ١٩٢٨دا لەگەڵ چەند لاوێك (کۆمەڵەی زەردەشت)یان دامەزراند. لە ١٩٣٠ دوای کارەساتەکانی ڕۆژی ڕەشی (٦)ی ئەیلوول لەگەڵ چەند کەسانێك بۆی دەردەچنو دەچنە گوندی (پیران) لای (شێخ مەحموود)، هەروەها بەشداری ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٣١ی کردووە بە فەرماندەی (شێخی نەمر). لە ١٩٥٤– ١٩٥٥ خۆی خانەنشین کردووە.

لە پێشەکی دیوانەکەیدا کە لە ١٩٥٨ لە بەغدا چاپکراوە، د. مەعرووف خەزنەدار دەنووسێو دەڵێ (سەلام زیاتر شاعیرێکی

نیشتمانو نەتەوەیە، چونکە کاتی گەنجی سەلام، نەتەوەی کورد بە دەورێکی تایبەت تێدەپەڕی لە ژیانیدا). لە بابەت شیعرە دەروونییەکانییەوە دەڵێ (خەیاڵێکی ڕوونی تێدایەو شعورێکی ڕاست دەردەخا، وەکو وشەکانی لە ناخی دەروونیا بێنە دەرەوە وایە).

یەك لە شاکارەکانی شێخ سەلام وەرگێڕانی چوارینەکانی (خەیام)ە لە فارسییەوە بۆ کوردی، کە بەڕاستی گیانی خەیامی لە وەرگێڕانەکەدا بە تەواوی پاراستووەو بە باشترین وەرگێڕان دادەنرێ، سەلام لە ساڵی ١٩٥٩ز لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد:

**ئەمەش نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی:**

## وەتەن چییە؟

هەستە لە خەو ئەی لاوی کورد
تێبکۆشە بە دەستو برد
هاوار ئەکا دایکی وەتەن
وا گیان ئەدا، پیادا بگەن
خاكو گوڵو گوڵو گیا
شاخو چەمو چڵو چیا
ڕەنگاو ڕەنگی کەژی سیا
هاوار ئەکەن بە جیا جیا
وا مەزانە خاکی وەتەن
ئاوو گڵە دارو دەوەن

پشت و ئەژنۆ، جەرگ و دڵە
ئەجدادی تۆ شێرانی کورد
لە ڕێی وەتەن بە مەردیی مرد
مردن، ڕزین بوون بەم خاکە
وەتەن دایك، وەتەن باوك، وەتەن کاکە.

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| | | |
|---|---|---|
| بە دەست و برد | : | بە گورج و گۆڵی |
| پیادا بگەن | : | پێی ڕابگەن، بگەهنێ |
| کەژ | : | چیا، شاخ |
| سیا | : | ڕەش |
| ئەژنۆ | : | چۆك |

## ( ئەحمەد موختار جاف )

ئەحمەد موختار کوڕی وەسمان پاشای گەورەی عەشیرەتی (جاف)ە. لە ساڵی ١٣١٦ی کۆچی کە هەردوو ساڵی (١٨٩٨- ١٨٩٩)ز دەگرێتەوە لە شاری هەڵەبجە لە دایك بووە، دایکیشی (خانمی وەسمان پاشا) یەکێك بووە لە ژنە ناودارو هەڵکەوتووەکانی کورد. لە تەمەنی حەفت ساڵیدا دەخرێتە بەر خوێندن. لە ساڵانی ١٩١٩- ١٩٢٤ قایمقامی قەزای هەڵەبجە بووە، پاشان بووە بە ئەندامی پەرلەمانی عیراق.

ئەحمەد موختار دۆستو هەڤاڵی زۆربەی شاعیرو ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی خۆی بووە، وەك بێکەسو گۆرانو سەلامو عەبدولواحید نوریو زۆرانی تر. لە هۆنراوەکانی دا ڕێچکەی نیشتمانپەروەریو ئەڤینی گرتووە. هەروەها سەرەڕای هۆنراویش پەخشانە چیرۆکەکی هەیە بەناوی (مەسەلەی ویژدان) کە لەساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا چاپو بڵاوکراوەتەوە. لە ڕۆژی (٦)ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣٥ز دەستێکی پیس لەسەر ڕووباری سیروان شەهیدی دەکاتو دەچێتە ڕیزی نەمرانەوە. ئەمەش نموونەییێکە لە هۆنراوەکانی:

١. لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزلو هونەرتانە

٢. دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بێکەس و مەزلووم
بە گورجی بیبڕن ئەو ڕێگە دوورە وا لە بەرتانە

٣. بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئانو زەمانێ عەینی قەلغانو سوپەرتانە

٤. بە خۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە مەحبوبە
کە تۆزی وەك جەواهیر سورمەو کوحلی بەسەرتانە
٥. بەسەر خاکا ئەگەر نازیش بکەن حەقتانە کوردینە
تەماشای سێبەری ئەو شاخو کێوە وا لەسەرتانە
٦. بەبێ قەدری بەسەریا ڕامەبوورن حورمەتی بگرن
گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە
٧. دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەیی جەهلە
لە سایەی عیلمەوە ئەمڕۆ ئیتر نۆبەی زەفەرتانە
٨. زوبانی حاڵی (ئەحمەد) هەر ئەڵێ وریابن ئەی میللەت
بزانن بەردی ئەم شاخانە ئەلماسو گوهەرتانە

(هەموو هۆنراوەکە بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| هەڵسن | : | هەستن، ڕابن |
| دەسا | : | دەی، زووکەن، لەزکەن، خێراکەن |
| بە گورجی | : | بەخێرایی، بلەزی |
| تیغ | : | تیخ، کێرد، چەقوو |
| سورمەو کوحل | : | کل، جۆرە تۆزێکە چاوی پێ جوان دەکرێ |
| ڕامەبوورن | : | هاتوچۆ مەکەن، تێمە پەڕن |
| لە سایەی | : | لە سێبەری |
| گوهەرتانە | : | گەوهەرتانە |

# هێمن

## ١٩٢١- ١٩٨٦

هێمن ناوی (سەید موحەمەد ئەمین)ە کوڕی سەید حەسەنی شێخەل ئیسلامی موکرییە، لە ساڵی (١٩٢١)ز بە شەوی جەژنی بەراتێ لە گوندی لاچین نزیك شاری مەهاباد لە دایك بووە. لە تەمەنی منداڵیدا چووەتە بەر خوێندن، سەرەتا ئەلفو بێی لای مامۆستا سەعید ناکام خوێندووە پاشان باوکی ناردوویەتی بۆ شاری مەهاباد بۆ ئەوەی لە قوتابخانەی دەوڵەتیی بخوێنێت. لەوێ تا پۆلی چوارەمی خوێندووە، ئینجا باوکی ناردی بۆ قوتابخانەی ئایینی، لە خانەقای شێخی بورهان ماوەیەك مایەوە، بەڵام خوێندنەکەی ڕێكو پێك نەبووە، دواتر لەلای هەندێك مەلای تر خوێندوویەتی.

لە ساڵی (١٩٤٢)ز کە کۆمەڵەی (ژ. ك) دامەزرا، هێمن ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەو کۆمەڵە بووە، لەسەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەوری دیاری کراوی هەبووە، هەر دەنگی دلێری شیعریو نووسەری باڵادەستی ئەو کۆمارە بووە. لە ١٩٨٦/٤/١٨ز کۆچی دوایی کردووەو لە مەهاباد گیانی بە خاك سپاردووە.

هێمن یەکێکە لە شاعیرە هەر بەرزەکانی کورد لە سەدەی بیستەمدا. هۆنراوەکانی هێمن هەر لەسەرەتاوە لە چوار چێوەی شاعیرو نووسەران دەرچووەو لەناو خەڵکی کوردستان بڵاوبۆتەوەو لە دڵی هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەر جێی خۆی کردۆتەوە.

هـۆنراوەی شـاعیرە کلاسـیکییەکانی کـورد کاریـان کردۆتـە سـەری بەتایبەتی هۆنراوەی نالّی، هەروەها هۆنراوەکانی گۆران لەسەر هێمن بێ کاریگەر نەبوون.

هەستی نیشتمان پەروەری‌و جوانیی سروشـتی کوردسـتان‌و جـوانیی ژن ئیلـهام دەری شـاعیربوون. زمـانی ئـەدەبی لـە شـیعری هـێمن دا بـە کوردییەکی ڕەوان‌و جوان‌و پەتییە، ئەدیب‌و شاعیران پێیان خۆشەو هەم نەخوێندەوارانیش لێی تێ دەگەن.

هێمن هەر شاعیر نەبووە بەڵکو پەخشان نووسێکی هەڵکـەوتوو بـووە وەکو لە پێشەکییەکەی دیوانی (تاریك‌و ڕوون) دەردەکەوێ.

هـێمن چـیرۆك نووسـێکی بـە توانـاو گـەورە بـوو. لـە بەرهەمـە چاپکراوەکانی دا (تاریك‌و ڕوون، نالـەی جـودایی، هـەواری خـاڵی، ڕیـزی نان بگرن).

﴿ئەمەش نموونەیەکە لەهۆنراوەکانی هێمن لە دیوانی تاریك و ڕوون﴾

## تـۆم هـەر لـەبیرە

لە شاییدا لە وەختی هەڵپەڕینا
لە خۆشیدا لەکاتی پێکەنینا
لە کۆڕی ماتەم‌و گریان‌و شینا
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

بە شەو تاکو بە سەرما زاڵ دەبێ خەو

بەڕۆژ تاکو دووبارە دێتەوە شەو

لە کاتێکدا کە دەدوێنم ئەمو ئەو

ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

زەمانێکە کە دەچمە سەیری گوڵزار

لەگەڵ پۆلی ڕەفیقانی وەفادار

تەنانەت وەختی دەسبازی لەگەڵ یار

ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

دەکەم تەرخان لە ڕێی تۆدا ژیانم

لە سەنگەردا بەرەو ڕووی دوژمنانم

بە خاکی تۆ دەمی ئاویلکە دانم

ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

ماتەم : شین و شەپۆڕ، گریان

دەدوێنم : قسەی لەگەڵ دەکەم

پۆلێ : تاقمێك

وەفادار : ئەمەکدار

ئاویلکەدان : سەرەمەرگ، کاتی مردن

# (ئەحمەدێ نالبەند)

هۆزانڤـانی دەڤـەری بادینـان نـاوی (ئەحمـەدێ کـوڕێ ئـەمینێ نالبەندە)ە بە (ئەحمـەد مـوخلیس) دهێتـە ناسـین. لـە سـاڵی (١٣٠٨)ی کۆچـی کـە دەکاتـە بەرامبـەر هـەردوو سـاڵی ١٨٩٠– ١٨٩١ز لـە گونـدی (بامەڕنێ)ی سەر بە قـەزای ئامێـدی لـە دایك بـووە. لـە تەمـەنی شـەش سـاڵیدا دەسـتی بـە قورئـان خوێنـدن کـردووە. بـۆ خوێنـدن چـووە بـۆ ئامێـدی، زاخـۆ، دهـۆكو گونـدی بیـدۆهێ لـە دەڤـەری بـەرواری ژۆری. ژیانێکی پڕ لە دەردە سەریو ناخۆشیو مشەخت بـوونی بەسـەر بردیـە، پیاوێکی قسە خۆشو نوکتە بێژو زمانزان بووە.

زۆربەی شاعیرە کۆنەکان کارێکی زۆریان لە هزرو بیرو باوەڕی نالبەند کردووە بـە تایبـەتی مـەلایێ جزیـری، هـەر لەبـەر ئـەوەش بـووە، وەکـو شــاعیرە کلاســیکییەکان زمــانێکی تێکــەڵێ لــە عــەرەبیو کــوردی بەکارهێناوە. نالبەندێ هۆزانڤان، هەڵبەستی بۆ ئەم مەبەستانە هۆنیـوە، ئانکۆ ڤەهاندیە:

١. پێ هەڵدانو پێ هەڵگوتنو وەسف کردن، کە نالبەنـد دەسـتێکی باڵای هەبووە لەو مەیدانەدا.
٢. ئەڤینیو ئەڤینداری.
٣. سۆفیاتیو لە خوا ترسان.
٤. هۆنراوەی کۆمەڵایەتی ئانکۆ جڤـاکی، کـە شـێوەی گاڵتـەو ترانـە بەخۆوە دەگرێت.

٥. کرێتکـردن‌و ناشـیرین پیـشاندانی بەرامبەرەکـەی، دیـارە لـەو مەبەستەش دا گۆی هونەری بردۆتەوە.

٦. کوردینی‌و وەلاتپارێزی.

نالبەندیێ هۆزانڤان لە (٩)ی ئەیلوولی سالی ١٩٦٣ز بەدەسـتی خـۆی، خۆی کوشتووەو لە گۆڕستـانی گونـدی (خـشخاشا) لـە دڤـەری بـەرواری ژۆری نێژراوە (هاتیە ڤەشارتن).

**ئەمەش نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی:**

١. دوهـــی ســـپێدێ ل ســـەربانی
م جانـــەك دیـــت ژ خـــەو ڕابـــوو
٢. ژ مـــال دەرکـــەت دەرێ خـــانی
م تـــەخمین کـــر زولـــەیخا بـــوو
٣. زولـــەیخابوو ســـفەت حـــۆری
وەکـــی تـــیرێ ژمـــە ڕابـــۆری
٤. چـوو سـەر ئـاڤێ ل ڕەخـێ ژۆری
وەکـــی ڕۆژێ ل مـــە ئاڤـــا بـــوو
٥. دەمـــا زڤـــری ژ ســـەر ئـــاڤێ
م دیـــت لێـــدا شـــەقا تـــاڤێ
٦. مقابـــل چـــوومە هنـــداڤێ
قـــەرە پۆشـــی گرێـــدا بـــوو

٧. دەمـــا تـــاڤێ ل بـــەژنێ دا
م دیـــت شـــبهی گـــولا ســـپێدا

٨. وەســا گــەش بـــوو دنــاڤ رێــدا
چوو حال بۆ کەس نەهێلا بوو

٩. نــەهێلابوو بــۆ کــەس حالــەك
دەقیقــەك ل مــن ببــوو ســالەك

١٠. ل ئـــەنیا وێ هـــەبوو خالـــەك
خــودێ حــەق تــازە کێــشا بــوو

(هەشت دێری بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| دوهی سپێدێ | : | دوێنێ سبەینێ، دوێنی بەیانی. |
| م جانەك دیت | : | من جوانێکم دیت. |
| ژ خەو ڕابوو | : | لە خەو هەستابوو. |
| وەکی تیرێ | : | وەکو تیر |
| دەما زڤڕی | : | کە گەڕاوە |
| شەقا تاڤێ | : | تیشکی هەتاو |
| چوومە هنداڤێ | : | چوومە لای |
| وەسا گەش بوو | : | وەها گەش بوو |
| لە ئەنیاوێ | : | لە هەنیەی ئەو، لە نێو چەوانیدا. |
| دەرێ خانی | : | دەرەوەی ماڵ یان خانوو. |
| ژمە ڕابۆری | : | بە پێشماندا تێپەڕی. |
| تاڤ | : | هەتا، خۆر. |

## ( مەلا ئەنوەرێ مایی )

مەلا ئەنوەرێ مایی، تۆرڤانو مێژوو نووس‌و هۆزانڤان بوو، نیشتمان پەروەر وەلاتپارێزو کورد پەروەر بوو، خەباتکارو جانفیدابوو. ناوی (ئەنوەری کوڕێ شێخ محەمەد تاهیرێ مایی‌یە) لە سالی ۱۹۱۳ز لە گوندی (مایێ) لە ناوچەی بەرواری ژۆری لەدایك بوویە. تەمەنی دوو سالان بوو کە باوکی ئەمری خودا بەجێ دەهێنێ. تا تەمەنی دەبێتە شەش سالێ هەر لە گوندی (مایێ) دەبێ، پاشان دایکاوی، ئەوی دەنێریتە گوندی (بامەڕنێ) بۆ خوێندن، هەر لەو گوندە خوێندنی سەرەتایی بە دویماهی دینیت، بەلام لەبەر دەستکورتی خوێندنی ناوەندی پێ تەواو نەبووەو ملی داوەتە خوێندنی ئایینی‌و بە فەقێیەتی لە زاخۆ و دهۆك‌و ئامێدی‌و شوێنانی دیکەی بەسەربردووە.

لە سالی ۱۹۳٦ز دەستوورنامەی مەلایەتی پێدراوە. لە گوندەکانی (شێروان مەزن)و (بارزان)و لەناو (عەشیرەتی هەرکی) دەرسی داوە. گەلێك کاری میری کردووە. زۆرجاران تووشی ڕاونان‌و گرتن بووە، لە سالی ۱۹٤٦ز بۆ ماوەی بیست‌و دوو مانگان دەخرێتە بەندیخانەوە، یەك بووە لەو ڕەوشنبیر ڕووناکبیرە کوردانەی کە پشتەڤان‌و هاریکاری شۆڕشی (۱٤)ی تەموزی (۱۹۵۸) یان کردووە. ئەندامی یەکیەتی ئەدیبانی عیراق بووە. دەیان گوتارو نووسینی لەسەر ئەدەب‌و مێژووی کورد بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی نووسیوە. لە سالی ۱۹۵۹ز لەگەلێ وەفدێکی میللی بە سەردان چووە بۆ (چینی میللی)و لەوێ گوتارێکی بە نرخی لەسەر ڕەوشنبیری‌و مێژووی کوردان داوە. گەلێك

هۆزانو گوتاری لەسەر ئەدەبو کوردان بڵاوکردۆتەوە، لە ڕۆژی (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢ز لە شۆڕشی بەرەڤانی لە بوونی نەتەوەی کورد شەهید دەکریٚو دەچێتە ڕیزی نەمرانەوە.

## پرسا من ژ خودێ

١. خودا وەندێ پاكو سەخیو میهرەبان
دلۆڤانی، هەردەم ژ بۆمە هەمان

٢. هەموو کار، بدەستێ تەنەبێ شکە
چ فەرمان بکەی دێ ببیت بێ ڤەمان

٣. دزانم دگەل کەس تەنینە چوکین
دزانم ژ بۆ هەر کەسەك توی خودان

٤. هەمی دنیا ئەفرۆ تەکریە مرۆڤ
ژ بۆ هەر کەسێ تەکری یار، زەمان

٥. ژبۆ هەر کەسێ تەکری دۆست فەلەك
ژبلی مە کوردان نەما بێ شڤان

٦. نێ ئەم ژ سەپانو بەندێت تەنە
مەهشیار کە یا خودێ مەزن ژ خەوان

٧. چ گوننەهـ هەیە مە خودایێ بلند
چ سووچ مە هەیە ئەی خودا، دابزان

٨. مەبینە ل سەر ڕێکەکا ڕاستو ڕوهن
ژ پشتامە باڤێ ڤی بارێ گران

٩. تۆ ئازا بکە ڤی وەلاتی کمێد
بکێشە دەری وی، دەست تاسبان

(لەسەرەتاوە حەفت دێڕ بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤەی پەیڤان:

| | | |
|---|---|---|
| دلۆڤانی | : | تۆ بەرەحمی، بە بەزەیی |
| ژبۆم هەمان | : | بۆ هەمووومان، بۆ مەهەمیا |
| بێ ڤەمان | : | بێ مانەوە، بێ وەستان |
| چوکین | : | هیچ کینەو بوغزێك |
| تەکریە | : | تۆ کردووتە بە. |
| مەهشیارکە | : | هوشیارمان کەوە |
| یاخودێ من | : | ئەی خودای گەورە |
| چ گوننەهـ هەیەمە | : | ئایا ئێمە هیچ گوناحێکمان هەیەز |
| روهن | : | روون |

ژ پشتامە باڤێ بارێ گران: ئەو بارە گرانەمان لە کۆڵ کەوە

| | | |
|---|---|---|
| بێ شکە | : | بێ گومانە |
| ژ بلی | : | بێجگە لە |
| شڤان | : | شوان |
| نێ ئەم | : | بەڵام ئێمە |
| یا خودێ مەزن | : | ئەی خودای گەورە |
| مەبینە | : | بمان هێنە |
| ژ پشتامە باڤێ | : | لەسەرمان لاببە، لە کۆڵمان بکەوە. |

## عەبدولواحید نوری

نووسەر ناوی عەبدولواحید مەجیدە، لە ساڵی (١٩٠٤)ز لە دایك بووە، هێشتا هەر منداڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووەو لە نازو خۆشەویستیی باوکی بێ بەش بووە، بەڵام خاڵی نەی هێشتووە بێ باوکیی پێوە دیار بێ‌و دەستی بەسەر داهێناوەو لەگەڵ منداڵەکانی خۆی دا جیای نەکردۆتەوە، خستوویەتییە بەر خوێندن تاکو بووە بە مامۆستا.

یەکەمجار لە هەڵەبجە دامەزرا، کە گوستراوەتەوە بۆ سولەیمانی پاش ماوەیەك بووە بە جێگری سەرۆکی شارەوانی سولەیمانی، لەدوا جاردا لە قوتابخانەی فەیسەلییەی سەرەتایی دەبێتەوە مامۆستا، هەر لەوێ دەمێنێتەوە تاکو بە نەخۆشی سیل لە ڕۆژی پێنجی تەمووزی ساڵی (١٩٤٤)ز کۆچی دوایی کردووەو گیانی پاکی بە خاك سپاردووە.

مامۆستا عەبدولواحید بەرامبەر بەو هەموو چاکەیەی کە خاڵی (نوری عەلی) لەگەڵیدا کردووە، هەموو نووسینەکانی بەناوی (ع. و. نوری) واتە (عەبدوالوحید نوری) نووسیوە. بۆیە هەر بەو ناوەشەوە ناوبانگی دەرکردووە. مامۆستا عەبدولواحید نوری مامۆستایەکی نموونەیی ڕاستەقینەبوو، دڵسۆز بوو بۆ قوتابییەکان، پەروەردەی دەکردن بۆ ژیان، بۆ دوا ڕۆژێکی پڕ لە کامەرانی. بە مامۆستایی گەلێك کەسی بە بیری نیشتمان پەروەری‌و پێشکەوتن خواز پەروەردە کرد. لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەیە کە بیری پێشکەوتن خوازییان لەناو کورددا بڵاو کردۆتەوە.

نووسەرێکی مەزن بوو، تێکۆشەرێکی کورد بوو، لەزۆر مەیدان دا خزمەتی کوردی کردووە، لەو ماوە کورتەی ژیانیدا گەلێك کتێبو نامیلکەی پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە.

## بۆ لاوان:

## بەرزیی کوردی

ع. و. نووری
له گەلاوێژی ژمارە (٦,٥) ساڵی (١)

**لاوان!**

**چونکی ئێوە هەوێنی ژیانی دوا ڕۆژمانن هەموو هاوارێکم بۆ ئێوەیە: هەموو ئەبینن چۆن گەلاوێژ تەقەلا ئەدا کە کوردی بەرز بکاتەوە، جوان ئەو نووسینانەتان خوێندۆتەوە!**

**براکانم!**

**وا بوو بە بیست ساڵ خەریکی نووسینم، چاك خراپ هەندێ کتێب هێنرایە کایەوە! لەم چەرخەدا جوان تێگەیشتم کوردی لە بنچینەدا لەڕو لاواز نەبووەو نییە، ئێمە خۆمان لەڕو لاوازین، لەخوێندنا کەم تەرخەمو لە نووسیندا بێ باکین! ئێمە خۆمان... ڕەنگە دوژمنانی ئەم وتەیەم بڵێن فەرموو وەرە کیمیایەکمان بۆ تەرجەمە بکە!**

**لە پێش ئەوەدا پاسوختان بەمەوە پێتان ئەڵێم: زمانی زانست لە گێتی دایە یەکە دوو نییە.**

چۆن ناتوانین بە (Napolion) بڵێین (دارا) هەروەها ناتوانین بە (Hidrogin) بڵێین غازی سووك چونكی شیرازەی مەدەنێت تێك ئەچیٚو ئە ئالۆزیٚو سەر لیٚ شێوانی لە دوایە. ئیمرۆ ئەبیٚ چاك بزانین لە ڕۆژ هەڵاتا توركەكان بە هەموو هێزی خۆیانەوە هەوڵ ئەدەن خۆیان لە ڕۆژهەڵاتێتی دوور خەنەوە بەڵام ناتوانن زمانەكەیان وەك ئەورووپایی لیٚ بكەن!

بە پێویستی زمان تیپی فرانسزی بەكار دێنن چۆن كوردانی قەفقاسیا لە نووسینا بیٚ چار فرانسزی بەكاردێنن!

كوردی.... وەك گوڵێكی ڕەگ زلی سیسی قەراغ ڕووبارێكی وشك وایە... وە ڕیشوی ڕەگی بە هەموو لایەكدا بڵاوبۆتەوە!

ئەبیٚ خۆتان بكەن بە ئاو ئەو ڕووبارە تەڕ بكەنەوە هەر یەكە لە عاستی خۆی ئەم گوڵە جوانە ئاو بدا، تا بگەشێتەوە، چ ئێوەو چ ناحەزی كورد ئەبیٚ وەك مانگی چواردە ببینن‌و بزانن كوردی ئەژیٚو نامریٚو لە مردن لە چەند لایەكەوە ڕزگار كرا.

ئێوە گەر بە جەوهەرن... بنووسن، ئێوە گەر بەهۆشن بخوێننەوە... ئێوە ئەگەر لاون! بنووسن‌و بخوێنن. بە خوتو خۆڕایی سەر زەنش مەكەن، ئەم خانووە كە ئێمە ئەمانەویٚ بیكەین بۆ پاراستنی زمانی كوردی ئەبیٚ بە ڕووناكی چاوو خوێنی لەش قوڕی بۆ بگرینەوە.

**ئیتر مەبن بە درِكو دالّ لە ڕێی ژیان بۆ کاول کردنی زمانەکە مەڕۆن، بۆ ڕازاننەوەی بڕۆن، براکان! دەبێ ببن بە پرد تا کوردی بەسەر لاشەتانا بڕوا بۆ بەرزی!**

(لەسەرەتای پەخشانەکەوە تا دەوەرە

کیمیایەکمان بۆ تەرجەمە بکە بۆ لەبەرکردنە).

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| گەلاوێژ | : | گۆڤارێکی ئەدەبی زانستی کوردی بوو، دەسالّ بە ڕێكو پێکی دەرچوو (١٩٣٩-١٩٤٩) خزمەتێکی زۆری زمانو ئەدەبیاتی کوردی کرد. |
| پاسوختان بدەمەوە | : | وەلامتان بدەمەوە، بەرسڤێ وە بدەم |
| بە خوتو خۆڕایی | : | بە بەلاش، لە خۆڕا |
| کەمتەرخەم | : | بێ باك |
| گێتی | : | جیهان |
| سەرزەنش | : | لۆمە کردن |
| درِك | : | درِی، ستری |
| قوڕ | : | کوڕ |

## ئیبراهیم ئەحمەد (بلە)

ساڵی ١٩١٥ لە سلێمانی لەدایکبووە، ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا کۆلێجی یاسای تەواو کردووەو دوایی بۆتە دادوەر. ئەو ساڵەی کۆلێجی مافی تەواو کرد نامیلکەیەکی بەناوی (الاکراد والعرب) بڵاوکردەوە، کە باس لە پەیوەندی نێوان هەردوو نەتەوەو ئاسۆی هاوکاریان دەکات.

لەنێوان ساڵانی ١٩٣٩– ١٩٤٩ بە هاوکاری خوالێخۆشبوو عەلائەدین سەجادی گۆڤاری (گەلاوێژ) یان دەرکردووە. ئەو گۆڤارە سەردەمێکی زێڕینی لە ژیانی ئەدەبو ڕۆژنامەنووسی کوردیدا هێنایە پێشەوەو زمانی کوردیشی لە دڕکو داڵ پاک کردەوە.

ئیبراهیم ئەحمەد یەکێکە لە پەخشان نووسە هەرە دیارەکانی کوردو ڕووداوی نالەباری خۆماڵی، چەوساوەو هەژاران، نرکەو ڕاپەڕینی جوتیاران، ڕەوشی ڕامیاری، ژیانی پڕ لە مەینەتی ژنانی کوردو کۆڕی خەبات، سیمای هەرە دیاری ناو چیرۆکو ڕۆمانو پەخشانەکانی ئەم کەڵە نووسەرەن.

لە شیعریشدا، شیعری جوانو پڕ واتای هەیە، یادگارو هیوا لە پارچە شیعرە هەرە بەرزەکانی ئەم نووسەرەن... ئیبراهیم ئەحمەد، بەهۆی هەستی نەتەوایەتیو چالاکی ڕامیارییەوە، لە ساڵی ١٩٤٩ ڕەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کراوە، بەهۆی ئەم گرتنەش چرای گەلاوێژ کوژاوەتەوە.

ئیبراهیم ئەحمەد جگە لە چیرۆكو پەخشانو شیعرو وەرگێڕان، ڕۆژنامە نووسێكی بە تواناشبوو. ساڵی ١٩٥٨ خاوەنی ڕۆژنامەی (خەبات) بووە.

لە بەرهەمەكانی، كۆمەڵە چیرۆكی (كوێرەوەری)، لە ڕۆمانەكانی ڕۆمانی (ژانی گەل)و بەم دواییەش ڕۆمانی (دڕكو گوڵ)ی بە چاپ گەیاندووە. ماوەیەك سكرتێری پارتی دیموكراتی كوردستان بووە، لە ٨/٤/٢٠٠٠دا لە لەندەن كۆچی دوایی كردووە.

## بەرەو ڕووناكی

**(پەخشان)**

**لەناو جەرگەی تاریكییەوە**

**دەست بە كەلەپچەو تەوق لە ملو زنجیر لە پێ**

**لە كانگای نەزانییو هەژارییو دیلییەوە...**

**كەوتوومە ڕێ، هاتووم ئەڕۆم بەرەو ڕووناكی**

****          **          ****

**ناو چاوانم تفی پیا دێتە خوارەوە**

**پێم شەلی داركارییە**

**فرمێسك لە چاوما قەتیس ماوە**

**پێستم بە سەر ئێسكما وشك بۆتەوە**

**بەڵام بە دڵێكی وەك پۆڵاوە**

**ڕێم گرتۆتە بەر ئەڕۆم بەرەو ڕووناكی**

ماندووم‌و ڕێگاکەم دوورە

برسیم، دوژمنەکانم تێرن، ڕووتم‌و ئەوان پۆشتەن

بێ هێزم‌و ئەوان بە دەسەلاتن

من دەست‌و پێ بەستراوم‌و ئەوان بەڕەلان

لەگەڵ ئەوەشا بە ویستێکی نەگۆڕەوە

بە گیانێکی نەبەزو زاتێکی مەردانەوە

ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی

نا... نا من هەر خۆم نیم

بە تەنیا نەکەوتوومە ڕێ

هەزاران هەزاران هەزارین

بەرەو ڕووناکی ئەڕۆین‌و

بێ گومان بە کوێرایی چاوی هەموو دوژمنان

سەرە ڕای هەموو

سەختی‌و تووشی‌و مەترسی‌و تاریکی ڕێ‌و بان

گەیوین‌و ئەیگەینێ

** ** **

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێكدانەوەی وشەكان:

حقوق : ماف

نامیلكە : كتێبی بچووك

گەلاوێژ : ١. ئەستێرەی گەلاوێژ، ٢. مانگی سێیەمی هاوینە، ٣. ناوی ئەو گۆڤارەیە كە بەڕێزان (عەلائەدین سوجادیو ئیبراهیم ئەحمەد) لە ساڵانی ١٩٣٩- ١٩٤٩ بەیەكەوە دەریانكردووەو زۆربەی شاعیرانو نووسەرانی كوردیش بەشدارییان تێدا كردووە...

ڕەوش : بار، دۆخ

مەینەتی : ناخۆشی، كوڵو كۆڤان

كەڵەنووسەر : نووسەرێكی بە توانا، نڤیسەرەكی مەزن

ڕۆمان : چیرۆكی درێژ

قەتیس ماوە : پەنگی خواردووەتەوە

سیما : ڕوخسار، خاسیەت

بە ویستێكی نەگۆڕەوە : بە ئیرادەیەكی بەهێزەوە

تووش : ناخۆشی، سەختی، مشەختی

(سەرچاوە: زمانو ئەدەبی كوردی
پۆلی یەكەمی ناوەندی/ سلێمانی)

# بەشی خوێندنەوە

# ئەحمەد شەوقی[1].

ئەگەر بێت و چاوێك بە مێژووی ئەدەبیاتی كوردیو عەرەبیو زمانەكانی دراوسێی كوردا بخێشێنین، دەبینین كە گەلێ شاعیرو نووسەرو فەیلەسوفی هەڵكەوتوو هەن جگە لە زمانی دایكی بە زمانی یەكێك لەو گەلە موسلمانانەی دراوسێی شیعرو هونەری نووسیوە وەیا هەن كە بەیەكێك لەو زمانانە بەتایبەتی عەرەبی شیعرو نووسینی ووتووەو تۆمار كردووە (ئەحمەد شەوقی) یەكێكە لەوانەی كە باسمان كردن.

شەوقی یەكێكە لە شاعیرە هەرە بەرزەكانی ئەدەبیاتی عەرەبو جێی شانازییانە لە هەمان كاتدا بە یەكێك لە شاعیرە بەرزەكانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەژمێرێت، شەوقی لە قاهیرەی میسر لەدایك بووەو لەوێ پێ گەیشتووەو خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە میسر تەواوكردووە، وە لە فەرەنسا حقوقی خوێندووە، بەڵام كاروباری شەڕی گەورەی یەكەمو دوورخستنەوەی بۆ (ئەندەلووس)و، زرنگیو هەستی نازكیو خوورەوشتی جوانی وای لێ كردووە كە هەست ئێشو ئازارو ناخۆشی باری وڵاتەكەی بكاتو وەكو شاعیرێكی نیشتمانو میللەت پەروەر هەستی خۆی دەربرێت، چ بە شیعرو چ بە نووسین، لەبەر ئەمە دەبینین شەوقی هەروەكو (فیكتۆر هۆگۆ)ی شاعیری فەرەنسی كە لە ئاوارەیی گەڕایەوە، هەستو ئارەزووی گەلی میسری- ژێر دەستی

---

(١) شەوقی لە پێشەكی بەشی یەكەمی دیوانەكەی خۆیدا كە ناوی (الشوقیات)ەو خۆی دەری كردووە، دەڵێت: "باوكم خوای لێ خۆش بێت، بنەچەو ڕەگەزمانی دەبردە سەر كوردەكان..."

ئیستعمار- لەناو دوو تۆی وشە ڕەنگینەکانی شیعرو پەخشانەکانیدا دەردەبڕێتو داوای ڕزگاریی گەلو وڵاتی دەکرد، لە دەستی زۆردارو زۆری، شەوقی بە قەسیدەو پارچە شیعرە نیشتمانییەکانی دەری خست کە دەست نیشانی کۆشکی پاشاکان نییەو شاعیری گەلە. شەوقی هەروەکو گەلێ شاعیرو نووسەری تر شاعیری بەرزی ئینگلیز (شەکسبیر) کاری تێ کردووە، ئەمەش لە داستانی (مصرع کلیوباترە)- کوشتنی کلیوباترە-دا بە تەواوی دەردەکەوێت لە بەرهەمە هونەرییەکانی شەوقیدا گەلێ مەبەستی بەرزو باڵا دەربارەی ژیانو مرۆڤایەتیو سروشتو هەستی نەتەواویەتی بەدی دەکرێت. دیوانە گەورەکەی شەوقی پڕە لە پارچەی شیعری وا کە پۆپەی شیعری وریا بوونەوەی ئەم چەرخەیە. جگە لەمانەش شەوقی بە پێشەنگی کاروانی بوژاندنەوەی شیعر دەژمێررێت، سەرەڕای ئەوەی کە لەنووسینی چیرۆکی شانۆگەریدا دەستێکی باڵای بووە، بەرهەمە بەنرخەکانی شەوقی ئەمانەن: (شوقیات، مجنون لیلی، قمبیز، مصرع کلیوباترا، اسواق الذهب).

ئەمە نموونەیەکە لە شیعرەکانی ئەحمەد شەوقی کە کراوە بە کوردی:

(ئەو بولبولانەی کوندە پە پوو پەروەردەی کردن)[1].

ئەڵێن (سلەیمان)[2] زمانی هەموو، مەلی ئەزانی

ئەکەوتە گفتوگۆ لە گەلیاندا، زۆر بە ئاسانی

کوندە پەپوو زۆر ڕێزی بوو لەلای، پێی ووت سلەیمان،

ئەم بولبولانەم بۆ پەروەردە کە بەدڵو بە گیان

ڕۆژێك حەزی کرد بێن بۆ خزمەتی، بۆ چاوپێکەوتن

هاتنە بەردەمی، بەڕێز کە وەستان تێر سەیری کردن

کزۆڵە دیاربوون، بێ تواناو تاقەت، بێ هێـــــزو لاواز

هەرچەندە هەوڵیان دا، لەگەڵ سلەیمان نەکەوتنە راز

سلەیمان وتی ئەم بولبولانە، من ئاوام دەوێـــــــــن

هەرچی چۆنێك بێت، سەر برینیشی بێ، هەر تیمار بکرێن

پەپوو سلەیمانکە[3] هاتە پێشەوە، ئازاو دەستو برد

عەرزی گەورەی خۆی- زۆر بەڕێزەوە- ئا بەم جۆرە کرد:

ئەم بولبولانەی کە دەیان بینی، کەڕو لاڵ نەبوون،

پەروەردەکەریان کوندە پەپوو بوو، بۆیە وا دەرچوون!!

---

(١) ئەمە ئەو شیعرەیە کە ئەحمەد شەوقی بەناوی (البلابل التی البوم)ەوە گوتویەتی، وا لێرەدا بەشێوەی شیعر، کرا بە کوردی.

(٢) مەبەست سلەیمان پێغەمبەرە.

(٣) پەپووسلەیمانکە: واتە دارکوکەی سلەیمان پێغەمبەرە.

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| هەڵکەوتوو | : | لێ هاتوو |
| شانازی | : | خۆبادان، فەخر. |
| داموو دەستگا | : | دامەزرێنراوی میری |
| ئاوارەیی | : | دوورکەوتنەوە لە وڵات |
| دوو تۆی | : | لەنێوان، بەین |
| دەست نیشان | : | دانراو |
| پێشەنگ | : | ڕابەر، ڕێبەر |

## گفتوگۆ:

١. شەوقی شاعیری گەلە ئایا، ڕاستە یان نا؟ بۆچی؟

٢. شەوقی لە پێشەکی دیوانی (الشوقیات)دا دەربارەی ڕەگەزی خۆی دەڵێت چی؟

٣. شەوقی لەژێر کاریگەری کام شاعیری ئینگلیزدا بووە؟

٤. ئایا شەوقی جگە لە شیعر پەخشانو چیرۆکی هەیە؟

٥. ناوی چەند شاعیرو نووسەری تر بنووسە کە کورد بوونو بەڵام بەکوردی بەرهەمیان لەپاش بەجێ نەماوە.

٦. مەبەستی شاعیر لەم شیعرە چییە؟

# گەشتوگوزار، وەرزش و ڕۆشنبیرییە

جاران هاتوچۆ زۆر ناخۆش و نالەبار بوو، مرۆڤ زۆر ئازاری دەچێشت و گەلێك ماندوو دەبوو. تا ئێستاش هاتوچۆ لە هەندێك وڵاتی دواکەوتوو دوور لە شارستانییەوە، نەك هەر مایەی هیلاکی و کەنەفتییە، بەڵکو مەترسیشی تێدایە و مرۆڤ تووشی گەلێك گێچەڵ و کارەسات دەبێت.

بەڵام هاتوچۆی ئەمڕۆ وەك جاران نییە، بەڵکو گەشت و گوزارو خۆش ڕابواردنە. مرۆڤ بۆ ماوەیەك لە ئەرك و سەرقاڵی ڕۆژانە دوور دەکەوێتەوە، بۆ ئەوەی بایەکی باڵی خۆی بدات و بحەسێتەوە. ئنجا لەو سەرەوە بە گیانێکی نوێ و ئارەزوویەکی تەواوەوە، دێتەوە سەر کارو کاسبی خۆی. دە هەر لەبەر ئەمەیە کە دەبینیت ئەمڕۆ دەست کورت و کەم دەرامەتەکانیش حەز بە گەشتوگوزار دەکەن و بوونەتە گەڕیدە.

بەڵێ ئەمڕۆ هەر کەسێك ئارەزووی گەشتوگوزاری کرد، مەرج نییە دەوڵەمەند بووبێت، ئەوەتا دەستەیەك لاوانی تازە پێ گەیشتوو، پەیدابوون، گەشتوگوزارەکەیان هەر ئەوەندەی تێ دەچێت کە لەماڵی خۆیاندا دەیخۆن و لایان وایە کە گەشتوگوزار هونەرێکی جوانە، سەیر دەکەیت قوتابیی وڵاتێکی وەکو نەمسا یان ئەڵمانیا، بەپێ یان بە سواری پایسکل، وڵاتان دەگەڕێت، مەگەر کاتێك سواری فارگۆنی ژمارە سێ یان چواری شەمەندەفەر ببێت کە پارەیەکی مۆڵی پێ بێت لە هەر شوێنێك شەوی لێ داهات، دەست دەبات جانتاکەی دەکاتەوەو چادرە بچکۆڵە قەد کراوەکەی دەردەهێنێت و هەڵی دەدات و لەژێریدا دەخەوێت،

خۆ ئەگەر وای نەکرد لە خانێکی بچووك یان لە کادانی ماڵە جووتیارێکدا ڕۆژ دەکاتەوە.

ئێستا باشم لە بیرە کە یەکەم جاری خەوتنی ناو کادانم لە گەشتوگوزاردا، ئەو جارەبوو کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ دەستەیەك قوتابییانو دەرچووانی دانشگاکانی ئەنگلستاندا چووین بۆ وڵاتی ئەسکەندیناڤیا، کادانێکی گەورەیان لە ناوەڕاستی کێڵگەیەکدا پیشان داین، کادانەکە لە تەختە دروست کرابوو کارەباشی تێدابوو، کە چووینە ناوەوە هەریەکەمان دەستی کرد بە کا کۆکردنەوەو جێگا بۆ خۆش کردن، جێگای خەوتنێکمان دروست کرد گەرمو گوڕو خۆش، ئیتر بۆ خۆمان تا بەیانی لێی خەوتین، خەوێکی قووڵو یەك ژەمی، بەیانی کە هەستاین لەخەو بۆمان دەرکەوت کە هەموومان خرپ خەومان لێ کەوتبوو کەسمان خەبەرمان نەبوو بوەوە، ئنجا کە لە کادانەکە هاتینە دەرەوە، دانیشتوانی ئەو شوێنە قسەی خۆشیان لەگەڵدا کردینو دەستی ڕێزیان لێ ناین.

وە نەبێت لەو وڵاتانەدا، هەر کادان دەست کەوێتو ئیتر هیچی تر، بەڵکو گەلێك شوێنی تر بۆ حەسانەوەو خەوتن وە دەست دەکەوێت، وەك شوێنی ئەو قوتابییانەی کە هاوینان دەگەڕێنەوە ناو کەسو کاری خۆیان، یان وەك شوێنی پاپۆڕەوانەکان، کە بە پاپۆڕ دەڕۆنو شوێنەکانیان بەجێ دەهێڵنو بە خاڵێتی دەمێننەوە. ئەمە جگە لەوەی لە دێهاتو شارە بچکۆلەکانیشدا شوێنی خەوتن وە چنگ دەکەوێت.

ئەگەر گەڕیدەیەك ڕێی بکەوێتە یەکێك لەو شوێنانە، ژوورێکی خاڵی لە ماڵێکدا دەدۆزێتەوەو بە پارەیەکی کەم دەیگرێت بەکرێ.

گەشتوگوزار هەلێکە دەبێت لە کیس نەدرێتو هەر دەرفەتێکمان دەست کەوت دەبێت بچین بۆ گەڕانو شوێن ببینین. بەهۆی گەشوگوزارەوە فێری زۆر شت دەبین، کاتێك گەڕیدە سوود لە گەشتو گەڕانو هاتوچۆ وەردەگرێت کە ڕۆشنبیرو وریا بێت، نەك وابزانێت، کە بە پارەی زۆرەوە دەتوانێت سوود وەربگرێتو فێر ببێت.

## لێکدانەوەی وشەکان:

کەنەفت : ماندوو، وەستان

گێچەڵ : ئاستەنگ

کارەسات : کاری سەخت، ڕووداو

سەرقاڵ : سەرگێژی

دەرفەت : دەلیڤە، فرسەت

گەڕیدە : گەڕهوك

## گفتوگـۆ:

١. بۆچی جاران هاتوچۆ ناخۆش بوو؟

٢. ئێستا بەهۆی چییەوە دەتوانین بە ئیسراحەت هاتوچۆ بکەین؟

٣. بۆ ئەوەی بتوانین هاتوچۆ بکەین‌و بچین بۆ گەشتوگوزار، ئایا مەرجە دەوڵەمەند بین؟

٤. چۆن لاوانی تازە پێگەیشتوو، لە ئەوروپا دەتوانن بە پارەیەکی کەم بە ئارەزووی خۆیان بگەڕێن.

٥. ئایا لەم وڵاتەی خۆتدا گەڕاویت؟ ئەگەر گەڕاویت لە گەڕانەکەتدا هەر خۆت بەتەنها بوویت یان لەگەڵ خەڵکی تردا بوویت؟

٦. ئایا دەتوانیت لەگەڵ هاوڕێکانتا بۆ چەند ڕۆژێك بە پارەیەکی کەم بۆ شوێنێکی نزیك بچیت بۆ گەشت‌و گەڕان؟

٧. ئەگەر تا ئێستا نەچوویت، ئایا دەتوانیت بەم نزیکانە بچیت؟

# چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردی

## لە (شانۆی ناومالْ) بە دەستکارییەوە[1].

پیاوێکی دەڵەمەندو بە سامان نابووت بوو، هیچی نەما بەندەیەك نەبێت، ڕۆژێك بە بەندەکەی گوت: کوڕم ئێمە لەم شارە هیچمان بۆ ناکرێت، من دەناسن، ڕووم نایەت دەست لە کەس پان بکەمەوەو هەندێك ئیشیشم بۆ ناکرێت، هەتا ئەمڕۆ مەزنو ناسراو بووم. زەمین گەلێك فراوانە. با بچین بۆ وڵاتێکی دی بەڵکو خودا چارەسەرێکمان بکات.

ڕۆیشتن، لە وڵاتی خۆیان دوور کەوتنەوەو گەیشتنە شارێك، تەماشایان کرد، خەڵکی ئەو شارە کۆم بوون، تومەز پادشایان مردووە، پادشا بۆ خۆیان دادەنێن. ئادەتی ئەو گاڤەش ئۆسابوو، بازیان هەڵداوە، بەسەری هەر کەسەوە نیشتبێتەوە ئەویان کردووە بە پادشا. بەندە ڕووی کردە خودانیو گوتی: ئەی گەورەی من، ئەگەر خودا کردی، ئەم بازە بەسەری تۆوە نیشتەوە، تۆ لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە چی دەکەیت؟ وتی:

– کوڕم، ئەوە دوورە لەمن کە خودا بە دەردو مەینەتی دووچاری کردووم.

---

(١) (شانۆی ناومالْ) کتێبێکی خوا لێ خۆشبوو مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوولە کە ناوبانگی بە (سەفوەت) دەرکردبوو، ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا لە چاپ دراوە، هەروەها گولستانی شێخی سەعدیی کردووە بە کوردیو دیوانێکی شیعرو گەلێك کتێبی تری چاپ کراوو چاپ نەکراوی هەیە، لە ساڵی ١٩٦٣ لە سلێمانی وەفاتی کردووە.

بەندە گووتی:

- قوربان، ئەمە ئیشە، بەڵکو خودا کردی!.

گوتی:

- بەڕاستی خزمەتیان دەکەم. خودا چۆنی فەرمووە بەوە جۆرە کردەوەیان لەگەڵ دەکەم. ئەی کۆیلە ئەگەر بەسەر تۆوە نیشتەوە چی دەکەیت؟

گوتی:

- من شەل و کوێرم ناپارێزم، تێیان دەکەوم، سزایان دەدەم، یەکێک پیاوێک بکوژێت، دەیکوژمەوە. ئەوی شکاتی کردووە ئەویش دەکوژم، ئەوی شایەتی دا ئەویش دەکوژم، پیاوێک دزی بکات دەیکوژم، ماڵ دزراویش دەکوژم. ئەوەی شایەتی دا ئەویش دەکوژم. ڕاستیی چی خودا فەرموویەتی من وەسا لەگەڵ وان ناکەم.

گەورە گوتی:

- جا ئەمە ئینسافە؟

کۆیلە گوتی:

- جا خودا دەکات زۆرم لەکێ کردووە؟ یا گوێی لەم وتانە نییە؟

ڕۆیشتن، لە سوچێکەوە نزیک ئەو خەڵکە وەستان. بازیان هەڵدا، هات، گەڕا، زۆر بەسەر خەڵکەکەدا سووڕایەوە. هەتا کۆیلەی دۆزییەوە، بە سەرییەوە نیشتەوە. کە سەیریان کرد کۆیلەیەکی ڕەش، لچ شۆڕی ناشیرینی، ئێسک قورسە.

گوتیان:

- باز خەڵەتی کردووە.

هەڵیان دایەوە، دووبارە بەسەرییەوە نیشتەوە، دیسان گووتیان:

- باز خەڵەتی کردووە، چۆن ئەمە بۆ پادشایی دەست دەدات، جاری سێیەم هەڵیان دایەوە هەر بەسەر ئەوەوە نیشتەوە! ئیتر چارەیان نەما، کردیان بە پادشا. هەرایان بۆ دروست کردوو چووە سەر تەختی پادشایی.

دەستی کرد بە ئیش، بەڵام چۆن؟ هەرچی وتبوو بەزیادەوە تەپڵی تۆپێنی پێ کردن. کەسێك کەسێکی دەکوشت دەیکوشتەوە. خاوەن کوژراوو کێ ئاگاداری بوو دەیکوشت. یەکێك دزیی بکردایە بە ماڵ دزراوو بە شایەتەوە دەیکوشتن. گەیاندییە ڕادەیەك هیچ کەس بۆ هیچ شت نەیدەتوانی داد داوا بکات، یا دەنگی لێوە بێت. بە ڕۆژ ئەمە ئیشی بوو، بە شەو کاتێك دیوان چۆڵ دەبوو، دەبووەوە بە بەندەی گەورەکەیو دەکەوتە خزمەتو حورمەتی.

پیاوە ماقووڵو تێ گەیشتوانی شار کۆبوونەوە گوتیان: ئێمە ئەم بەندە ڕەشەمان کرد بە پادشای خۆمان، خۆ وا ئێمەی تەنگ کرد، چارمان چییەو چی بکەین؟ یەکێك لەوان گوتی: ئەمە پیاوێکی لە تەکدایە زۆری حورمەت دەگرێت. با بچین تکا لەو پیاوە بکەین، تکامان بۆ بکات، بەڵکو وازمان لێ بهێنێت بەم دەردەمان نەبات. چوونە لای گەورە گوتیان:

- قوربان تۆ دەزانیت، ئێمە خۆمان ئەم ڕەشەمان کرد بە پادشا بۆ ئەوە بوو خزمەتی ئێمە بکات، بەڵام ئەمە نازانین تۆ ئاگاداریت یان نا؟ هیچی نەهێشت، وا پیاوێك پیاوێك دەکوژێت، ئەم دیکوژێتەوە باشە، بەڵام باوکی کوژراوەکە بۆچ دەکوژێت؟ یا شایەتەکان بۆچ؟ ئەوا دز دەکوژێت؟ ئەی ماڵ دزرا؟ یاخود شایەتەکانیش بۆچ دەکوژێت؟ تۆ لەلای ئەو بەڕێزیت، تکای لێ بکە بە عەدڵو داد لەگەڵمان بجووڵێتەوە. گەورە پەیمانی دانێ کە پێی بێژێت. شەو بەسەرداهات، دوای چۆڵ بوونی دیوان، کابرای پادشا بووەوە بە کۆیلە بەرامبەربە گەورەی وەستا.

گەورە گوتی:

- ڕۆڵە تۆ بۆچ لە خودا شەرم ناکەیت. ئێمە لە برسێتیدا وڵاتی خۆمان چۆڵ کردوو دەرەبدەر بووین، ئێستا خودا کردووینی بە پادشا، بۆچی سوپاسی خودا ناکەیت؟ بۆچی وا لەم هۆزە دەکەیت کە لەپڕ پەلامارمان بدەن بمانکوژن، کۆیلە گوتی:

- گەورەم ڕۆژەکەت لەبیر نایەت لە قەراغ شار، من لەتۆم پرسی ئەگەر خودا تۆی کرد بە پادشا چی دەکەیت لەگەڵ ئەمانە، تۆ گوتت: خودا چی فەرمووە بەو جۆرە کردەوە لەگەڵ ئەوان دەکەم. من گوتم: خودا چی فەرمووە وایان لەگەڵ ناکەم، قەڵاچۆیان تێ دەخەم، خودا ئاگاداربوو، ئەگەر شایانی عەدڵو دادبوونایە خودا تۆی دەکرد بە پادشایان. بەڵام شایانی ئەمەن کە من لەگەڵ ئەوانی دەکەم، ئێستاش من لەم کردارە پەشیمان نابمەوە هەتا ئەوان

تۆبەیەکی بەڕاستی دەکەن. ئەگەر تۆبەیان کرد، خـودا دڵـی منیـان بۆ نەرم دەکات، کە بـە عـەدڵو داد، لەگـەڵیان بجووڵێمـەوە. ئـەوان تۆبەیان کردو ئەمیش باش بوو.

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | |
|---|---|
| ئێمە لەم شارە هیچمان پێ ناکرێت: | مە ل باژێڕی نەشێن چ بکەین. |
| کۆم بوون | : کۆبوونەوە، گردبوون، گردبوونەوە. |
| یەکێك لەوان وتی | : یەك ژوان گۆت. |
| وازمان لێ بێنە | : ژمە بگەڕێ، مەبەردە. |
| پێی بێژێت | : ببێژێتەوی، بەو بڵێت، پێی بڵێت |
| بمانکوژن | : مەبکوژن |
| کردووینی | : مەکرییە |
| لە تەکیدایە | : لە گەڵیدایە، ب ویرایە، پێ رایە. |
| بەندە | : کۆیلە، عەبد. |
| گەورە | : مەزن. |
| فراوان | : فرە |
| بڕۆین | : بچین، بمەشنین |
| خودا | : خوا، یەزدان، بینایی چاوان |
| شار | : باژێر |
| من دەناسن | : م ناس دکەن |
| لەگەڵ وان | : ب وانرا، لەگەڵ ئەواندا. |

| | | |
|---|---|---|
| نەختێ | : | کەمێك، پیچەك |
| چۆڵ بوو | : | ڤالآبوو، والآبوو |
| خودان | : | خاوەن، ساحێب صاحب |
| دروستی کرد | : | چێ کر |
| ئێمە خۆمان | : | مە بۆ خۆ. |
| ڕۆلەم | : | کوڕم، کوڕی من |
| گاڤ | : | کات، وەخت |
| ئۆسا | : | ئۆسان، هۆسان، هۆسا، ئاوا |
| قەراغ شار | : | کەنا شار، رەخی بازێر |
| هۆز | : | گەل، میللەت. |

## گفتوگۆ:

١. بەم چیرۆکەدا چ پەندێکی کوردیت دێت بە بیردا؟ لە مامۆستا باوك یان برات بپرسە ئەم پەندەت تێ بگەیەنن: (خودا کێو نەبینێت بەفری تێ ناکات). یا مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەت بۆ ڕوون بکەنەوە: (لا یغیر الله ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم).

٢. بە کورتی باسی سوودی ئەم چیرۆکە بکە.

٣. مانای (فۆلکلۆر) لە مامۆستا بپرسە.

# مازوو چنین

وڵاتی کوردستان هەروەکو هەموو وڵاتێکی بە پیتو فەڕ، زەوی‌و زارو شاخ‌و داخی زۆرەو بێ بەش نییە لەکان‌و دارو درەختی بەردارو بێ بەری بە سوودو قازانج. یەکێك لەو درەختانەی کە لە کوێستانەکانماندا هەن‌و کەژو کێوو نزاری داپۆشیوەو دەستی سروشت پەروەردەی کردوون، درەختی مازووە، ئەم درەختە جگە لەوەی کە وەکو هەموو درەختێکی تر سەوزی‌و گەشە دەدا بە نزارەکانمان‌و گەڵاکەشی گزرەیە بۆ ئاژەڵەکانمان. سیچکەو بەرە گەڵاو مازوو، گەڵێ بەری تری هەیە کە هەریەکەیان سوودێکی تایبەتی هەیە، بەڵام لە هەموویان بە سوودترو باشتر (مازوو)ەکەیەتی کە لەگەڵ داو دەرماندا بەکاردەهێنرێت بۆ تیمارکردن، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە سوودێکی ئابووری هەیە کە کەلێنێك لە ئابووریی هێندێ شوێنی وڵاتەکەمان پڕ دەکاتەوە، بەوەی، کە نرخێکی بازرگانی هەیە ئەویش لەبەر بەکارهێنانی بۆ کاروباری پێستەخۆش کردن بە واتا بۆ (دەباخی)، جا لەبەر ئەمانە، لە کوێستانەکانماندا‌و لەو شوێنانەی مازوو هەیە، بەشێوەیەکی تایبەتی دەچن بۆ چنین‌و کۆکردنەوەی، ئەم کارەش پێی دەڵێن، مازوو چنین، ئەویش بەم جۆرەیە: پێش ئەوەی کاتی چنین بێت شارەزایان، مازوو چنین، ئەویش بەم جۆرەیە: پێش ئەوەی کاتی چنین بێت شارەزایان‌و پیاوانی چاپووك، بەپێ دەنێرن بۆ پارێزگاری‌و قەدەغەکردنی نزارەکە لە دزەمازوو، هەروەها بۆ دیاری کردنی شوێنەکانی، لەدواییدا کە کاتی گەیشتنی هات بەپێی نەریتی کۆن، بە تەقەو تفەنگ ئاواییەکە ئاگادار

دەکەن بۆ دەست پێکردنی، ئەمانیش هەر یەکە بە تویشو چەلاکی مازوو ڕنینەوە ئامادە دەبنو شەبەقی پیاوو ژنو کوڕو کچ دەدەنە دەم کەژو وەکو ڕێچکە مێرووله بەرەو نزار سەرەو ژوور دەبنەوە تا دەگەنە شوێنە دیاری کراوەکانو دەست دەکەن بە مازوو چنین. پیاوان لەسەر دارو بە داردەستیانو ژنو کچانیش بە پێوە لەدارە کۆڕپەو دەوەنەکان بەدەم گۆرانیو بالۆرێو پیاهەڵدان، چارۆکەو شتی خۆیانی لێ پڕ دەکەنو لە دەمەدەمی نیوەڕۆدا دووای ماندوو بوونو لۆوتو پڕبوونیان لە بۆنو تۆزی دارو مازوو بەرەو کانیو ئاوی نزیك ئەو شوێنە خل دەبنەوەو لەسەری وچان دەگرنو تێر ئاو دەبنو تێشوو بەرە دەکەنەوەو دەست دەکەن بە خواردن.

کە ماندوویەتی یان حەسایەوە، جار ناجارێ هەڵپەرکێشی بۆ دەکەن. بەم جۆرە ئەم بەرهەمە سروشتییە خودا کردووە کۆ دەکەنەوەو دەی بنەوە بۆ ئاواییو گوندو، ماندوویەتیان دەحەسێتەوەو ئنجا دەست دەکرێت بە فرۆشتنی بە چەرچیو خەڵقی شار لەوانەی کە خەریکی کڕینو فرۆشتنی مازوو کەتیرەو سەعلەمن.

لە مازوو کرندا هەروەکو هەموو کاروبارێکی هەرەوەزی ناو دێهاتەکاندا، گیانی تێکەڵو بێ جیاوازیی لە بەینی ژنو پیاو، کوڕوو کچ دا بەدی دەکرێت، جگە لەگیانی کۆمەکو یارمەتیو پاراستنی دارو دەوەنو سامانی سروشتیو خودا کرد.

## لێکدانەوەی وشەکان:

مازوو چنین : مازوو کردنەوە، کۆکردنەوەی مازوو، لێ کردنەوە

سوود : قازانج

تیمارکردن : دەرمان کردن

ئابووری : اقتصادی

چابووك : گورج و گۆڵ

## گفتوگۆ:

١. ناوی چەند درەختێك بڵێ کە لەخۆیەوەو دەستی سروشت پەروەردەی کردوون؟

٢. سوودی مازوو چییە؟

٣. بۆچی قەدەغەی نزارەکان دەکرێت لەپێش ئەوەدا دەست بکرێت بە مازوو چنین؟

٤. لە مازوو چنیندا چی بەدی دەکرێت؟

# مازوچنین لەلادێ

(قانیع)

ژینی لادێ سەیرانە
گەرچی تۆزێ گرانە
ڕۆژی نەورۆز ئەوەڵ ساڵ
ئەکەونە ئیش کوڕو کاڵ
یا جووت یا جۆگە هێنان
بۆ ئاو داشتن دەغڵو دان
یا داربڕینی شاخە
یاخود پەرژینی باخە
یا تووتنە یا درەو
ناوەستن بەڕۆژو شەو
یا گێرە یا شەن کردن
هەڵمەت بۆ فرمان بردن
فەرقی نییە نێرو مێ
هەرچی دانیشتووە لەدێ
هەموو خەریك فرمانن
بە دەست هێنانی نانن
تا تەواو ئەبێ هاوین
تێ ئەکۆشن زۆر بەتین
بەینێ لەویا بەتاڵن

خەریکی ئیشی ماڵن

کە ئیش ڕووی کردە تەواو

کۆ ئەبنۆ لە حەوزو ئاو

چەن دارێ بێ لای مزگەوت

هەندێ ڕاستو هەندێ چەوت

بۆ سێبەر نێژراوە

سەکۆی لەبن کراوە

خەڵکی دێ کە زۆرو کەم

لەسەر سەکۆ ئەبن جەم

تاوێ شەڕە ئاو پرژێن

بە گاڵتەوە شەڕە جوێن

تاوی باسی ژن هێنان

تاوی تاریق دەخلو دان

دووسێ ڕۆژێ بەم جۆرە

بە گۆرانیو بەهۆرە

ڕائەبوێرن بە شادی

گا گا، بیری ئازادی

گا تەگبیری جوتیاری

گا گا خەمی هەژاری

پیان بە سەبیل کێشان

باسی سۆفیو دەروێشان

باسی ژینی نارەحەت

باسی قەبرو قیامەت

مام خوا کەرەم! دنیا دیو

بانگ ئەکا! هەتیو مەتیو

بۆچی هێندە مناڵن

هەتاکو کەی لە ماڵن

بەراووردم تەواوە

تەقەی مازوو شکاوە

کێتان کوڕی مەیدانە

یاللا مازوو چنانە

ئینجا دەسەی کوڕو کاڵ

را ئەکەنۆ ڕووەو ماڵ

ئاوایی ئەیکەن بەقاو

قیڕەی مناڵ دەنگی پیاو

ئەوەی کە مازوو چن بێ

پیاو بێ وەیاخود ژن بێ

ئەوەڵ ڕۆژو، ئاخر شەو

پۆل ئەبەستن وەکو کەو

لە ڕێی یەك ڕائەوەستن

هەموو کۆمەڵ ئەبەستن

ئینجا ئەدەن بەهەردا

بـــــه شـــــاخو داخو زەردا
جـــار جـــارێ ئـــەهوولێنن
دوراو دوور یـــــەك ئـــــەدوێنن
قولـــــەو گـــــۆرانیو هـــــۆره
لێیـــــان ئـــــەبێت بـــــه نـــــۆره
کـــــه ڕۆژ گەییـــــه چێـــــشتینگاو
دەس ئەکـــــەن بـــــه قیـــــژوقاو
دێنـــــه خـــــوار لـــــه گـــــشت لاوه
ئـــــەڵێن: کـــــاتی ســـــەراوه
پـــۆل پـــۆل ڕیـــزه ئەبەســـتن
تـــا ســـەر ئـــاو ڕاناوەســـتن
لـــەویا هـــەتا نیـــو ســـەعات
نـــان ئـــەخۆن بـــێ دەنـــگو مـــات
ئـــەمجا یـــەکێ هەڵـــەدەو
تـــێ ئەچـــرکێنێ وەك کـــەو
کـــــڵاوی لار دائـــــــەنێ
بـــه دنیـــا پـــێ ئەکـــەنێ
ئـــەڵێ: بـــۆ ئـــاخری ئـــەمرن
هـــەتیو هەســـتن دەس بگـــرن
ئـــاوازی لێ هـــەڵ ئـــەبڕێ
رۆحـــی عاشـــقان ئەچـــڕێ

لەویا گشت ڕائەپەڕن
لە جێیەکا دەس ئەگرن
تەقلە چڵکن، ڕانك شڕ
لەویا ئەیکەن بە سمڕ
یەك گەنجێکی بالاّ جوان
سەر چۆپی ئەگرێ بۆیان
دەسەسڕی ئاڵ بە دەس
هەڵ ئەسووڕێنێ سەرمەس
نەزیاد ئەڕۆنو نەکەم
هەڵ ئەپەڕن بە بێ خەم
کچیش هەموو لەو لاوە
بەڕیزە ڕێك وەستاوە
کراس مۆرو سوخمەزەرد
کەوای ئاڵ ڕوومەت بێگەرد
هەر یەك دڵی لەلایە
بۆ خۆی خەریك سەودایە
جار جارێ گۆرانی بێژ
گەنم ڕەنگێکی درێژ
سەری وەر ئەچەرخێنێ
ڕیزی کچان ئەدوێنێ
دڵی هەر لەلای یارە

تەواو بێ ئیختیارە...!

سەرچۆپی کێش ساحیب یار

خۆی ئەلەرێنێ جار جار

هەر چەند یاری ئەبینێ

وەختە خۆی بپروکێنێ

لەسەرچۆپی، تا گاوان

ئەکەونە هەلە داوان

نازانن دنیا چۆنە!!

چۆنە ئەم چەرخە کۆنە

سەرچۆپی هەردوو دەستە

یەك بۆیەکتری مەستە

تێکەڵ ئەبن کچو کوڕ

بە چەشنی مێخەكو دوڕ

دەس ئەگرن بە تێکەڵاو

کچی شۆخو، کوڕی لاو

کچان کە جنسی نەرمن

تۆزقاڵە یێ بە شەرمن

لەویا شەرم نامێنێ

هەموو کەس خۆی ئەنوێنێ

تەقەی چەپڵەو هاژەی نەی

لەرەی مەمکەی چەشنی بەی

بۆنی مێخەكو سمڵ

ئەدا لەناو پەڕەی دڵ

کاتێ کە کچ مانوو بوو

دەس بەر ئەدەن بۆ پشوو

دووبارە چەشنی کەوباڕ

ئاژین ئەبن لە نزار

ڕووەو ماڵ بەدارەو دار

ئەسوورێنو تا ئێوار

یەکێ گەڵا، یەکێ دار

یا دوو لق یا پێڵەوار

ئەیبەن بۆ پێویستی ماڵ

ئاوایە ژیانی ساڵ.

# پوول زانستی‌و هونه‌رو ڕۆشنبیرییه

ڕه‌نگه ئه‌مڕۆ حه‌ز به پوول کۆکردنه‌وه‌و ڕێکخستن‌و بابه‌خ پێدانی له هه‌موو شتێکی تر زیاتر له‌سه‌ر ڕووی زه‌میندا بڵاوبووبێته‌وه‌و ناوبانگی سه‌ندبێت، گه‌وره‌و بچووك له هه‌موو که‌و قوژبنێکی جیهاندا، له‌ناو هه‌موو میلله‌تانداو به‌هه‌موو زمانێك بایه‌خیان پێ داوه.

پوول سه‌رچاوه‌یه‌کی گرنگی ڕۆشبیرییه، زانیارییه، ئاده‌میزاد به‌هۆی پوول کۆکردنه‌وه‌وه، وریاتر ده‌بێت‌و زیاتر شاره‌زایی هونه‌رو ئه‌ده‌ب‌و مێژوو وجوگرافیاو سیاسه‌ت‌و گه‌لێك جۆری تری زانستی ده‌بێت.

ئه‌گه‌ر ئه‌و پوولانه‌ی لێ ده‌ربکه‌ین، پێشینان به پوولی پۆسته یان به پوولی دارایی یان داده‌نا، ده‌توانین ئه‌و پووله‌ی، که له ساڵی ١٨٤٠ی زاینیدا له ئه‌نگلستان ده‌رچوو به یه‌که‌م پوولێکی دابنێین که له‌جیهاندا ده‌رچووه. ڕه‌نگیش هه‌یه نه‌مساوییه‌کان پێش ئه‌وان به ساڵێك واته له ساڵی ١٨٣٩دا پوولیان ده‌رکردبێت، به‌ڵام کۆمه‌ڵه پوولێکی ته‌واو که بۆ یه‌که‌مین جار ده‌رچووبێت، له ساڵی ١٨٧١ی زاینیدا بووه له ژاپۆن. ئنجا دوای ئه‌وه ئیتر پوول یان تاکه تاکه یان کۆمه‌ڵ کۆمه‌ڵ له هه‌موو لایه‌کی جیهانه‌وه ده‌ستی کرد به ده‌رچوون. ئه‌م پوولانه یان به‌هۆی ڕووداوێکی گرنگ‌و سه‌رکه‌وتنێکی گه‌وره‌وه ده‌رده‌چوون، یان ئه‌وانه‌ش نه‌بوونایه هه‌ر ناو به‌ناو ده‌رده‌چوون. دیسانه‌وه ئه‌م پوولانه له‌باره‌ی کاروباری ئاده‌میزاده‌وه وه‌ك وه‌رزش‌و وێنه‌و هه‌ڵکۆڵین‌و زانست‌و ده‌یان شتی تره‌وه ده‌رده‌چوون.

له ساڵی ١٨٧٤ی زاینیدا (یەکێتی پۆستە لەجیهان)دا دروست بوو، ئەم یەکێتییە لە دەستوورەکەیدا دەڵێت، کە هەموو کەسێك‌و هەموو کۆمەڵێك لە جیهاندا هەقی نامە بۆ یەکتر ناردنیان هەیە، کۆماری عێراقیش لەم یەکێتی‌یەدا ئەندامە، ئەم یەکێتی‌یە بڕیاری دا کە زمانی عەرەبیش یەکێك بێت لەو زمانانەی کە لە کاروباری خۆیدا بەکاریان دەهێنێت.

له وڵاتی ئێمەدا زۆر هەن لە ژن‌و لە پیاو، لە کچ‌و لە کوڕ، لە پیرو لەلاو، خەریکی پوول کۆکردنەوەن‌و کۆمەڵەیەکیش هەیە بۆ ئەوانەی کە حەز لە پوول کۆکردنەوە دەکەن، لە وڵاتی ئێمەدا هەمیشە بە بۆنە ڕووداوە نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و مرۆڤایەتییەکانەوە پوول دەردەچێت. یەکێك لە دەزگا ژمێرەکانی جیهان دەڵێت: پوول کۆکردنەوە، دڵ‌و دەروون خاوێن دەکات‌و فێری دان بەخۆداگرتنی دەکات... ئەوەی حەز بە پوول کۆکردنەوە بکات، ناچارە ناوی شارو وڵاتان فێرببێت‌و مێژووی ڕووداوو کەلەپووریان بزانێت. ڕەنگە (رولاندهێل) کە دەڵێن یەکەم کەسە پوولی پۆستەی داهێناو بەخەیاڵیدا نەهاتبێت کە ئەوا داهێنانەی ئەو ئەوەندە کار دەکاتە سەر مێژوو، ئەوەندەش دەور دەگێڕێت. بەڵام حەز بە پوول کۆکردنەوە لە کیژێکی ئەنگلستانییەوە داهات، ئەوەبوو ئەم کیژە لە ساڵی ١٨٤١ی زاینیدا، ئاگادارییەکی لە ڕۆژنامەدا بڵاو کردەوەو ووتی: من حەز دەکەم پوولێ بەکارهێنراوی پۆستە کۆبکەمەوە ئنجا تکا لەو کەسانە دەکەم کە پوولی کارکراویان هەیە بەبێ زەحمەت بۆ ئەم ناونیشانەی بنێرن، دیارە لە کۆتایی ئاگادارییەکەدا ناونیشانی خۆی بە

تەواوی نووسیبوو. ئەم کیژە شازدە هەزار پـوولی پۆسـتـەی کـۆکردەوەو دیواری ژوورەکەی خۆی پێ ڕازاندەوە.

نرخی هەندێك پوولی کـارکراوە، ئەوەنـدە بـەرز دەبێتـەوەو ئەوەنـدە گران دەبێت کە بەخەیاڵدا نایەت. پوولێك هەبوو لـە کۆمـاری هینـدۆراس لە کیشوەری ئەمەریکا لە ساڵی ١٩١٥ی زاینیـدا دەرچـوو بـوو، پوولەکـە خۆی کە دەرچوو نرخی چەند فلسێك بوو، بەڵام چونکە هەڵەیەکی چاپی تێدابوو، سەرنجی ئەوانەی ڕاکێشا، کە حەز بە پوول کۆکردنەوە دەکەن، بۆیە نرخەکەی بەرزبووەوەو گەیشتە نزیکەی سێ هەزار دیناری عیراقی.

بەهۆی پوولەوە گەلێك شـت دەزانـین‌و فێـر دەبـین‌و دڵ‌و دەروونمـان پاك دەبێتەوەو شارەزاییمان فراوان دەبێت، حـەز بـە پـوول کۆکردنـەوە ڕێگەیەکە بۆ پەروەردەکردنی ڕاست‌و زانیاریی زۆر.

### لێکدانەوەی وشەکان:

بابەخ : نرخ، بەها

کەل‌و قوژبن : کون‌و بن بیچ

کەلەپوور : پەرتولك

کیشوەر : قارە

## گفتوگۆ:

١. تۆ لەبارەی (حەز بە پوول کۆکردنەوە)وە چی دەڵێیت؟ ئایا تۆ خۆت یەکێکیت لەوانەی حەز بە پوول کۆکردنەوە دەکەن؟

٢. پوول، زانستیو هونەرو ڕۆشنبیریە، چۆن ئەم قسەیە ڕوون دەکەیتەوە.

٣. لە چ ساڵێکدا (یەکێتی پۆستە لە جیهان)دا دروست بوو؟ ئایا عێراق لەو یەکێتییەدا، ئەندامە؟

٤. لای ئێمە جگە لە پوولی پۆستە پوولی تریش بەکاردێت، ئایا دەزانی ئەو پوولانەیان بۆچی دەرکردووەو چەند جۆرن؟

# نـەورۆز

دیارە تۆ لەم تەمەندا گەلێك جار دیمەنی بەهارو جەژنی نەورۆزت دیوەو بەشداریی ئاهەنگو هەڵپەڕکێی ئەم ڕۆژە پیرۆزەت کردووە. دوور نییە جاروبار مامۆستاو کەس‌و کارو هاوڕێکانت لە جەژنی نەورۆزو پەیوەندیی بە میللەتی کوردەوە دووابن، تۆش گوێت بۆ شل کردبن‌و شتێکت لەم بابەتەوە بۆ ڕوون بووبێتەوە.

لە دێر زەمانەوە، میللەتان ڕێگای خەباتو تێکۆشانیان گرتووەو شوێن تروسکەی هیوا کەوتوون، بە شوێن خۆشی‌و پیتو فەڕو سەربەستی خۆیان‌و ئازادی نیشتمانەکانیاندا دەگەڕێن‌و شەیدای ئاسوودەیی‌و خۆش گوزەرانی‌و یەکسانی‌و ڕزگاری‌و سەربەرزین، بەڵام وەنەبێت، ئەم ڕێگایە هەروا تەختو ئاسان بێتو بە گوڵو گوڵزار ڕازابێتەوە، بەڵکو زۆر جار بە پێچەوانەی خواستی نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینەوە، کاروبار چۆتە دەست زۆردارێکی خوێن ڕێژی بێ فەڕی دڵ ڕەقەوە کە هەمیشە لە بیرکردنەوەدا بووە بۆ ئازاردان‌و چەوساندنەوەی میللەت. ئەم کارەساتانە لە مێژووی کۆن‌و نوێی گەلێك نەتەوەی سەرزەمیندا بوون. لەمانەش نەتەوەی کورد، کە نەتەوەیەکی ئازاو قارەمان‌و کۆڵ نەدەرە. یەکێك لەو کارەساتانەی کە چوونەتە مێژووی کۆنی نەتەوەکەتەوە، بەسەرهاتی زۆرداری‌و خوێن مژی یەکەی (ئەژدەهاك)و قارەمانێتییەکەی کاوەی ئاسنگەرە، ئەم بەسەرهاتە لەبەر ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا ڕووی داوە، سەیر دەکەین لەلای هەر

نەتەوەیەك بە جۆرێك ڕۆیشتووەو بە ئەفسانەو خەباتی میللییەوە تێكەڵ کراوە.

لەناو میللەتی کوردیشدا بەم شێوەیەی خوارەوە تۆمارکراوەو دەماو دەم ڕۆیشتووە.

دوو هەزار ساڵێك لەمەو بەر، کوردستان لەلایەن داگیرکەرێکی خوێن ڕێژەوە ژێر دەستە کراوەو خراوەتە بارێکی ناخۆش و سەختەوە، ئەم داگیرکەرە پادشایەکی بێگانەی سامناك بووەو بە خوێنی سەری لاوانی میللەتی کورد تینوو بووە. ئەژدەهاك تووشی نەخۆشییەکی سەیر دەبێت. لە ئەنجامیدا دوومارى مێشك خۆر، لە هەردوو شانی پەیدا دەبن، ئەم دوو مارە کە برسییان دەبوو دەمیان دادەپچڕی بۆ خۆراك، ئەگەر خۆراکەکە، مێشکی لاوان نەبووایە، ڕوویان وەردەگێڕاو دەیان فیشکان لەبەر ئەوە بەردەستەکانی ئەژدەهاك دەبوایە هەموو ڕۆژێك سەری دوو لاویان ببڕیایەو مێشکیان دەربهێنایەو بیانکردایە بە دەمی ئەو دوو مارەوە، میللەت کە سەیری دەکرد وا ڕۆژ بە ڕۆژ لاوە هەڵکەوتووەکانی لەناو دەبرێن و وڵات وردە وردە لاوی تێدا نامێنێت و هەر ڕۆژە دایکێك سك سووتاوو باوکێك جەرگ بڕاوو خوشکێك بێ براو منداڵێك بێ کاك دەبن. لەناووە پیشی دەخواردەوەو ڕقی هەڵ دەستا، چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو کە ببێت بە کڵپەیەکی ئاگرو بچێت بە ڕووی ئەژدەهاکدا.

لەناو باوکانی ئەو لاوانەدا پیاوێکی ئاسنگەر هەبوو ناوی (کاوە) بوو، ئەم کاوەی ئاسنگەرە قرچە لە جگەرییەوە دەهات، چونکە هەموو کوڕە

لاوەکانی کوژرابوونو کرا بوون بە خۆراکی مارە نەوسنەکانی سەرشانی ئەژدەهاكو تاقە کوڕێکی مابوو، بەردەستەکانی ئەژدەهاك هاتن بۆ ئەو تاقە کوڕەی بۆ ئەوەی بیبەنو بیکەن بە خۆراکی مارەکان، ئیتر کاوەی ئاسنگەر دنیای لەبەر چاو تاریك بوو ئارامی لە بەرهەڵگیراو وەك شێر نەڕانی بەسەریانداو هاواری کرد:

((نا.. نا... ئیتر جگەر گۆشەکانمان ناکەین بە خۆراکی مار)). بە هەموو هێزێکی خۆیەوە، چەند جارێك چەکوشەکەی دا بە دەزگاکەی بەردەمیداو وەك زەنگ دەنگی دایەوەو سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشاو وەك پڵنگ لە دووکانەکەی هاتە دەرەوە هاواری کرد: پیاوینە... مێرینە کار وا بڕوات هەر پیرو پەك کەوتەو منداڵمان دەمێنێتەوە، دەبێت منداڵیش بۆ خۆراکی مار گەورە بکەین، پیاوینە... مێرینە کار وا بڕوات لە گوڵی بۆن خۆشی لاوەکانتان بێ بەش دەبن، ئنجا دەستی برد پێش کۆشەکەی خۆی لەبەر کردەوەو کردی بە دروشمو هاواری کردەوە، بۆ سەر کۆشکی زۆرداری، پەلاماردەن مەترسن، مردن لە پێناوی ڕزگاریدا گەلێك لە ژیانی ژێر دەستی خۆشترە. هەموو هێرشیان بردو یەکەمین کەسێك گەیشتە سەر ئەژدەهاك، (کاوەی ئاسنگەر) بوو، کاوە چەکوشەکەی بەرزکردەوە بۆ تەپڵی سەری ئەژدەهاك، ئەوەندە توند دەستی داگرت هەموو پانایی چەکوشە کە چەقییە کەللەی سەری یەوەو گیانی لەبەر بڕی.

ئەو ڕۆژی هێرش بردنو لە ناوبردنی ئەژدەهاکە ڕێکەوتی یەکەم ڕۆژی بەهاری دەکرد کە یەکەم ڕۆژی مانگی نەورۆز (٢١)ی مانگی مارتە.

له ڕۆژێکدا بوو، که زستانی ساردو سۆڵ کۆتایی دێتو بەهار چیاو دڵو دەشتەکانی دەڕازێنێتەوە، بۆیە جەژنی کورد لەو ڕۆژەدا جەژنی دوو جەژنە، خۆشیو هەڵپەڕکێی سەرەتایی بەهاری ڕەنگینو هەڵهاتنی خۆری ڕزگاریو ئازادییە.

نیشانەی جەژنی نەورۆز ئاگرە، چونکە لەو سەردەمە دێرینەدا، کە ئەم بەسەرهاتەی تێدا ڕوویداوە، هاتوچۆکردن وەکو ئەمڕۆ ئاسانو خێرا نەبووە. لەبەر ئەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم مزگێنییە خۆشە، میللەت لەسەر لووتکە گەردن کەشەکانو یان چیاکاندا ئاگریان کردۆتەوەو بەم ئاگرە یەکترییان ئاگادارکردووە. تۆش وەك قوتابییەکی زرنگ، ئێستاکە لە چۆنێتیی ئەم جەژنەو جۆری پەیوەندیی بە میللەتەکەتەوە گەیشتیت، بیرت نەچێت لەم ڕۆژەدا جەژنی خۆت بەجوانترین شێوە بکەیت، بە جلو بەرگێکی خاوێنو جوانەوە. بە ڕوویەکی گەشو خۆشەوە لەگەڵ کەسو کارو هاوڕێکانتدا، ڕووبکەرە سەیرانی نەورۆز. دەتوانیت لەم ڕۆژەدا کارێکی سوودبەخشیش بکەیت بەوەی کە نەمامێك بنێژیتو وڵاتەکەتی پێ خۆشترو ڕەنگینتر بکەیت، ئەگەر هەمیشە نەمامی نوێ بڕوێتەوە، نیشتمانەکەت بێ دارو دارستان نابێت، چونکە کوردستان وڵاتی چیاو بەفرو گوڵو دارستانە.

## لێكدانەوەی وشەكان:

| | | |
|---|---|---|
| دێر زەمان | : | لە مێژدا |
| پیتو فەڕ | : | خێرو بەرەكەت |
| خۆش گوزەرانی | : | خۆش ژیان |
| خواست | : | داخوازی |
| ئەفسانە | : | ئوستورە |
| تۆمار | : | نووسین |
| دادەپچڕیٚ | : | دەمیٚ خۆڤەكر |
| كۆتایی | : | دوماهی |
| مزگێنی | : | مژدە |
| تەمەن | : | عومر |
| ئاهەنگ | : | سەیران |
| هەڵپەڕكیٚ | : | داوەت |
| شان | : | مل |
| مێشك | : | مەژی |
| خۆر | : | ڕۆژ |

## گفتوگۆ:

١. ئەژدەهاك پادشایەكی چۆن بووە؟

٢. بۆچی بەردەستەكانی ئەژدەهاك هەموو ڕۆژێك دوو لاویان دەكوشت؟

٣. كاوەی ئاسنگەر كێیە؟ كوڕەكانی چییان بەسەرهات؟

٤. چۆن كۆتایی بە ژیانی ئەژدەهاك هێنرا؟

٥. ئاگر نیشانەی چییە لە نەورۆزدا؟ بۆچی بووە بە نیشانەی نەورۆز.

## ڕاهێنان

(باسی نەورۆزی ئەمساڵ بكەو باسی هاوبەشی كردنی خۆشت بنووسە بە لاپەڕەیەك)

# ژیان چییه؟

ڕۆژێ لە ڕۆژان پۆلێ مەل لەسەر لقو پۆپی درەختێك دەیان خوێند، لە ساتێکدا کە مەستی خۆش خوێنی بوون، یەکێکیان گوتی: ئەرێ ژیان چییە؟ هەموو سەریان سوڕما لەم پرسیارە سەیرە، گەلێ لێکیان دایەوە، تا یەکێکیان گوتی (ژیان گۆرانییە). مێروولەیەك، کە لەولاوە تەقەلای دەدا، خۆی لەژێر گڵێ دەربێنێ، هەرکە سەری دەرهانیو ڕۆشنایی بینی گوتی: (نەء، ژیان تێکۆشانە لە تاریکیدا) لەولاوە گوڵێکی تازە پشکووتوو زاری ڕاگرتبوو بۆ هەنگێك، کە ماچێکی خاوێنو گەرمی بکات، گوتی: (ژیان خۆ دەرخستنو شادییە). هەنگێکی تر بەلایدا ڕۆییو گوتی: (نەء. بڵێ ژیان ڕۆژێکی خۆشی هاوینە). مێروولەیەك لەولاوە لە تۆپەڵێکی لە خۆی گرانتر ئالابوو هەڵی بگریت، ماتەمینی ماندوویەتی دایگرتبوو گوتی: (من لە تێکۆشینێکی سەختو ئەرکێکی گران زیاتری تێدا نابینم).

لەولاوە، باڵدارێکی تر پێکەنی، پێکەنینێکی وا کە هەوری خەمی سەر ڕووی بڕەوێنێتەوە. وەختەبوو کورەی تووڕەیی تا بسبێنێ گوڵو کۆی دابمرێنێتەوە ئەگەر شەستو ڕەهێڵەی باران نەبوایە، ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی: (ژیان فرمێسکە). بازێك ئاسمانی دەبڕی بە مەلە. دەیچریکاندو دەی گوت: (نەء، بە هەڵە چووی، ژیان هێزو ئازادییە).

لە پاش نەختێك تاریکیی هەڵمەتی هێناو شەو باری خست. مێشو مەگەز بە ویزەو ویزە لە لقو پۆپی درەختەکان دەووروکانو، دەیان گوت: (ژیان خەوە!). شارو دێ بێدەنگو کشو مات بوو، بەیان نزیك

بووەوە، قوتابییەك چرای ژوورەكەی خۆی كوژاندەوەو هەناسەیەكی هەڵكێشاو گوتی (ژیان قوتابخانەیە). هەرزەكارێكیش كە بەدخوویی هەڵی تەكاندبوو، شەوانی لە باوەشی ڕابواردندا بە گەمەوە دەسبازی بەسەر دەبرد، خەمو پەشیمانی لەدرزی دەروازەی دڵییەوە سەرەتاتكێ یان دەكرد دەی گوت: (ژین ئارەزوویەكە تەخت نابێت، خەوێكە نایەتە دی). بەیانیش بەشنەشن دەهاتو دەی گوت: (ژین گرێیەكە ناكرێتەوە، نەهێنییەكە ئاشكرا نابێت).

خۆر دەركەوت، دنیا ڕۆشن بووەوە، پۆپەی درەختانی پێشەكە زەرد هەڵگەران، بەیان ناوچەوانی ئەرزی ماچ كرد، هەموو لایەك دەنگی دەدایەوە ئەی گوت: (ژیان دەست پێ كردن و ئیش كردنە).

لە(یادگاری لاوان)ەوە وەرگێڕانی پارچە
پەخشانێكی(ڤیكتۆر هۆگۆ)یە

## لێكدانەوەی وشەكان:

| | | |
|---|---|---|
| گۆرانی | : | ستران، چریكە، ووتن |
| مێروولە | : | مێلوورە، مێروو |
| گەمە | : | یاری |

## گفتوگۆ:

١. بەلای هەنگەوە ژیان چی بوو؟
٢. بەلای مێروولەو بازەوە ژیان چی بوو؟ ئەی بەلای تۆوە چییە؟
٣. چی لەم نووسینە گەیشتیت؟
٤. ناوی (ڤكتۆر هۆگۆ)ت بیستووە یان نا؟ ئەگەر نەت بیستووە لە مامۆستاكەت بپرسە.
٥. (یادگاری لاوان) چییە؟ كتێبە یا گۆڤارە؟ كەی دەرچووەو لە كوێ؟ ئەگەر نەتزانی لە مامۆستاكەت بپرسە.

## هەنگ بەخێو کردن[1].

زۆربەی گیان لەبەران لە درندەو مێروو، جانەوەران بە تەنهایی دەژینو هەر یەکە ڕێگایەکی لە ژیاندا گرتووە، دوور لە هاوڕەگەزیو، پشتی بەخۆی بەستووە لە بۆ گەڕان بەدووای خواردنو دەربازبوون لە تەنگوچەڵەمەو بەسەرهاتدا. تەنانەت ڕێك دەکەوێت. کە دوو درندە یەکتر دەکوژن لەسەر نێچیر وەیا لەسەر مانەوە ئەگەرچی لەیەك ڕەگەزو ڕیشەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە جیهانی فراوانی جانەوەراندا گیانەوەرانی وا هەن، کە حەز بە تەنهایی ناکەنو بە کۆمەڵ بە یەکەوە دەژین، ژیانی بە کۆمەڵ لەناو ئەم جۆرانەدا لە گۆڕاندا بووە تا گەیشتۆتە ڕادەیەك کە باشترینو ڕێكو پێك ترین ژیان بە کۆمەڵ لەناو هێندێکیاندا هاتۆتە کایەوە، بەتایبەتی لەناو مێرواندا، وەك لەناو شارە مێروو لەو کوورە هەنگدا دەبینرێت. هەنگ لە زۆر کۆنەوە ناسراوە مرۆڤ بەخێوی کردووەو سووی لێ وەرگرتووە.

(١) خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت (واوحی ربك الى النحل ان اتخذي من الجبال بيوتاً ومن الشجر ومما تعرشون ثم كلي من كل الثمرات فاسلكي سبل ربك ذللا يخرج من بطونها شراب مختلف الوانة فيه شفاء للناس، ان في ذلك لاية لقوم يتفكرون). لە سورەتی (النحل) ئایەتی:٦٨،٦٩.

لە کوردستاندا، لە زۆر کۆنەوە هەنگ[1] بەخێوکردنو سوود لە هەنگوینو مێوەکەی زانراوە، چونکە جگە لەوەی کە هەنگوینی هەنگ وەك خواردنێك بەکاردەهێنرێت، وەکو دەرمانیش بۆ گەلێك نەخۆشیو کاروباری تر بەکارهێنراوە. هەنگ سەرچاوەی گەلێك ئەفسانەو چیرۆکی سەیر سەیر بووە لە میسرو یۆنانو رۆمای کۆندا.

بەخێوکردنی هەنگ لە کوردستاندا لەسەر شێوەی کۆنە- جگە لەو کێڵگەو شوێنانەی کە وەزارەتی کشتوکاڵ دەیبا بەڕێوە ئەویش بەم جۆرەیە:

پوورە هەنگەکە لەناو دەفرێکی لوولەییّ کە لەقوڕ کە (کاگلی) پیّ دەڵێن یا لەداری کلۆر وەیا لە جۆرە سەبەتەیەك، کە بەقوڕ کونو کەلەبەزی سواخ دراوە، دادەنرێتو لەسەرێکەوە کونێکی تیّ دەکرێت بۆ هاتووچۆیو دیوەکەی تری بە پارچەیەك قوڕ یا تەختە دەگیرێتو لە شوێنێکی سەرگیراودا بە تایبەتی لەزستاندا دادەنرێت، بەشێوەیەك کە دەمەکەی بۆ دەرەوە بێتو بەرەو قیبلە بۆ ئەوەی لە زستاندا بای ساردی تۆفو کرێوە نەی گرێتەوە، خۆ ئەگەر نزیك بایەخو گوڵزارو ئاوبێت ئەوا باشتر- چونکە هەنگ ژیانو بوونی بە گوڵو گوڵزارو ئاوو تەڕییەوەیە- لە کەشی بەهاردا لەو کاتەی کە هەموو گیان لەبەران

---

(١) دەوری دەهەزار جۆر هەنگ هەیە، تەنانەت لە ئەورووپادا دوو هەزار جۆر هەیە جگە لە ئەمریکا، لەناو ئەم هەموو جۆرانەدا پێنج سەد جۆریان بەیەکەوە لە شێوەی کوورەدا دەژین، وە لەمانەشدا جۆرێکی تایبەتی هەیە کە هەنگی هەنگوین (Apismell:fica) دەچێتەوە سەر ئەو جۆرە، لەهەموویان باشترو رێكو پێك تر بە کۆمەڵ دەژین.

دەبووژێنەوەو دەکەوونەوە گەڕ، کوورە هەنگیش دەست دەکات بە ئیش‌و هاتنە دەرەوەو گەڕان بە شوێن گوڵ‌و نێرگزداو دەست دەکات بە شیلەی گوڵ‌و درەخت مژین‌و هەلاڵە هێنان‌و شانە دروست کردن بۆ ئەوەی شاکەیان گەڕا دابنێت‌و، ئەمانیش پێیان بگەیەنن‌و بەخێویان بکەن‌و گەورەیان بکەن. لەم کاتەدا خاوەن کوورەکە، کە زانی هەنگەکان لە کاردان‌و ئیشی تەواو دەکەن‌و ژمارەیان زۆر بووەو جێگایان تەسکە دەهێنێت لە پشتەوە نیوە دەفرێکی تر کە (پاشەوانە)ی پێ دەڵێن، دەلکێنێت بە پشتی کوورەکەوە بۆ ئەوەی لەمەشدا شانەو گەراو هەنگوین دروست بکەن. خۆ ئەگەر ساڵێك بەهارەکەی تەڕبێت‌و گوڵ‌و گوڵاڵەو ئاوی زۆر بێت‌و سون (سن)‌و کوللە نەبن، هەنگ زووترو زۆرتر پەرەدەستێنێت‌و دەست دەکات بە پوورەدان (بێچو دەرکردنە دەرەوە) ئەم پوورەیەش، لەلایەن هەنگەوانەکەوە دەگیرێتەوەو دەخرێتە دەفرێکی ترەوەو دەبێت بە کورەیەکی تازە، ساڵی وا ڕێك دەکەوێت کە یەك کوورە دایکە دوو سێ پوورە دەدات.

هەنگ مێروویەکی زۆر ناسکەو زوو لەناو دەچێت[1] لەبەر پڕکاری‌و[2] خۆ خەریك کردنی بە ئیش‌و کاری کوورەکەیەوە، هەروەها تووشی نەخۆشی‌و وێرانی دەبێت، لەبەر ئەمە هەنگەوان هەر ماوەیەك پشتی کوورە کە دەکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێت ناو کوورەکە پاکە، شانەی

---

(١) پاراستنی هەنگ لە زەردەواڵەو مێروولە پێویستە.

(٢) تەنانەت ئەوەندە ئیش کەرە کە لە هاویندا لە شەوانی مانگەشەودا شەو کار دەکات کە پێی دەڵێن (شەو بە کێو).

نەکەوتووە، یا تووشی نەخۆشی نەبووە، بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوە، لە وڵاتی ئێمەدا بە تایبەتی لە پێ دەشتەکانیدا لەسەرەتای پایزدا وەیا لەگەڵ گەلاوێژ کەوتندا دەست دەکرێت بە بڕینی هەنگ بە واتا (هەنگوین دەرهێنان لە کورە). بەشێوەیەکی تایبەتیو وەستایانەوە بە مەرجێك بەشی کوورەکە لە هەنگوین بمێنێتەوە بۆ خواردنی زستانەی. کورد هەروەکو گوتمان، لە زۆر کۆنەوە هەنگی بەخێوکردووە، بۆ هەر شتێك وە یا جۆرێکی ناوی تایبەتی لێ ناوەو بە کارهێناوە. لەهەر کوورەیەکدا سێ جۆر هەنگ هەیە، شا، کەرهەنگ (نێرە)، ئیشکەر. ئەوەی هەنگ دەیهێنێت لە گوڵو گوڵزار بۆ بەخێوکردنی بێچووەکانیو هەنگوین دروستکردن هەڵاڵەو شیلەیە، ئەو بەشە هەنگەی لە دایکەکە کە (ماکی) پێ دەڵێن جیا دەبێتەوە (پوورە)ی پێ دەڵێن. هەنگ، شانەکانی لەو مێوە دروست دەکات، کە لەگوڵو درەخت دەی گرێت، هەر خانەیەك لەو خانانەی شانەکە (کەلو)ی پێ دەڵێن. ئەگەر شانەکان یەك لەدووای یەك پڕ بە پڕی دەمی دەفرەکە دروست بکات پێی دەڵێن (پەپکەشان) ئەگەر لاربێت پێی دەڵێن (لاشان)، ئەگەر ڕاست لە دەمی دەفرەکەو بۆ دووای دەفرەکە بێت، (تیرەشان)ی پێ دەڵێن، ئەو دەفرە بچووکەی دەدرێت لە پشتی کوورەکە (پاشەوان)ی پێی دەڵێن، بەو مێوەی کە لە زستاندا کونو کەلەبەری کوورەکەی پێ دەگرێت (بەرە مێو)ی پێ دەڵێن، ئەو نەخۆشیانەی تووشی هەنگ دەبێت هاڕیو مرەو ئەسپێیە.

## لێکدانەوەی وشەکان:

بەخێوکردن : خودان کردن

تەنگو چەڵەمە : ناخۆشیو گیروگرفت، ئاستەنگ

ڕەگەز : بنەچە، ڕیشە

مێرووله : مورچە، موریچە، مێرو

مێو : ئەو ماددەیە کە هەنگ شانەی لێ دروست دەکات

دەرمان : دارو

پوورە : بەو کۆمەڵە هەنگە دەوترێت کە لەکوورەی دایکە (ماکەوە) جیا دەبنەوە.

کوورە هەنگ : شارە هەنگ.

دەفر : ئەو شتەیە کە هەنگێ تێ دەخرێتو دەبێت بە شوێنو لانە.

تۆفو کرێوە : سەرماو سۆڵەوو بەفرو با، با گەلێر

هەڵاڵە : ئەو تۆزو گەردە ڕەنگاو ڕەنگی گوڵەیە کە هەنگ لە گوڵی دەکاتەوەو بە قاچەکانییەوە دەنوسێتو دەیهێنێت بۆ خواردنی بێچووەکانی.

## گفتوگۆ:

١. ئایا هەنگ بەتەنها دەژێت یا بە کۆمەڵ؟

٢. بۆچی لە کوردستاندا خەڵق هەنگ بەخێو دەکەن؟

٣. کە کوورە دایکەکە پوورەی دا هەنگەوانەکە چی دەکات؟

٤. بۆ ئەوەی هەنگ باش بەخێو بکرێتو هەنگوین زۆر بدات چی باشە بۆی؟

٥. پێویستە لە ڕێکوپێکیو کاروگوزاریدا چاو لەهەنگ بکرێت. لەسەر ئەمە وتارێك بنووسە.

# دەستی ماندوو لە سەر سکی تێرە

(هێمن) لە سەرەتای دیوانی (تاریك‌و ڕوون)ی خۆیدا گەلێك یادداشتی دەربارەی ژیانی خۆی‌و دەربارەی مێژووی چەندساڵەی خەباتی کوردانی کوردستانی ئێران تۆمارکردووە. با لەوەیان بگەڕێین بزانین ئەو شاعیرە چیی دەربارەی یەکێك لە ساڵە سەختەکانی کوردستان نووسیوە:

(هێمن) نووسیوییە، دەڵێت:

ساڵی ١٣٢٧[(١)] هیجری شەمسی ساڵێکی یەکجار تووش‌و شووم بوو. من بە عومری خۆم زستانی وا سەختم لە وڵاتی خۆمان نەدی بوو. پازدە ڕۆژی پاییز مابوو بەفرێکی ئەستوورە، وشك باری. یەك نوا لە هەموو جێگایەك لە میترێك پتر بوو، وشکە بەندو سەرماو سابیقەی بەدوادا هات‌و یەکسەر بوو بەڕوو، بەفری دیکەشی بەسەردا بارین، ڕێ‌و بان گیران، قات‌و قڕی پەیدابوو، ئاو وشك بوون‌و خەڵك ناچار بوو بەفر بتوێنێتەوەو بیخواتەوە. نەوت‌و ئاوردوو وەگیر نەدەکەوت، ئاژەڵ‌و ماڵات قڕانی کرد. ڕەستە رزین‌و نەوەندە خنکان‌و گرانی‌یەکی زۆر بە سامی بەداوادا هات. من بۆ خۆم لە ئەزموونی پیاوێکی دنیا دیدەو کۆنساڵ کەڵکم وەرگرت وتوانیم بەشێکی زۆر لە دەغڵ‌و دانی خۆمان لە ڕزین وزایە بوون ڕزگار بکەم. بەهار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو. بەڵام بەفر ئارەقیشی نەدەکرد. ڕۆژێك چوومە مزگەوت تەماشام کرد پیرە پیاوێك

---

(١) ساڵی ١٣٢٧ هیجری شەمسی دەکاتە دەوروبەری ساڵی ١٩٤٨ی میلادی.

به تەنێ لەتەنیشت سۆپە ساردو سڕەکە هەڵکوڕماوە. هەرمنی دیت گوتی: منداڵی ئەو زەمانە ئێمەی پێ خەرفاوە. گوتم مامە گیان چ قەوماوە؟

گوتی: بەسەری تۆ ئەوە چەند ڕۆژە بەو هەتیوە گێژانەی خۆم دەڵێم بچن بەفری سەر ڕەپستەکەمان کون کون بکەن گوێشم نادەنێ.

گوتم: جا بۆ کون کوی بکەن؟ گوتی: بۆ تۆش نازانی؟ گوتم ناوەڵلا. گوتی بیلامانێ کە ساڵ درەنگ بوو هەرد گەرم دادێو هەڵمێ دەکا. بەفریش نایەڵێ هەڵمەکە بێتە دەرو لە ناوخۆیدا دەگەڕێتەوەو دەغڵەکە دەسوتێ، ئەگەر کون بکرێ هەڵمەکەی دێتە دەرەوە ناسووتێ. قسەی مامە پیرەم بە دڵەوە نووسا، چەند ڕۆژان پیاوم هەلگرتنو چوومە زگ بەفر کون کردن. هەوا خۆش بوو، بەڵام کارەکە زۆر گران بوو، بەفرەکە ئەوەندە ڕەق بوو بە لۆسە کون نەدەکرا، بەڵام پاشان تێگەیشتم پێشینان چەند ڕاستە کە گوتویانە (دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە).
ئەمەی هێمنی شاعیر گێرایەوە، یادگاری کەسێكو خێزانێکە، بیرەوەری ئیش کردنو هەوڵدانێکە کە بووە بەهۆی ماڵو ڕەنج نەفەوتان. بەڵام ئەگەر وردە وردە لە کەناری ئەم بیرەوەرییە دووربکەوینەوەو ئاسۆی بیرمان فراوانتر بکەینو تەماشای هەموو وڵات بکەین یا تەماشای هەموو جیهان بکەین ئەوا ڕاستییەك دەبینین ئەویش ئەوەیە کە هەوڵدانو ڕەنج کێشان بەر دەگرێت، کە کەسی ئیشکەر دوا ڕۆژی ڕوونە، تێرە، کەسی بڵحی تەمەڵو ئیش نەکەر دوا ڕۆژی تاریکەو دەست ناخاتە سکی تێر، چونکە ئەو دەستە ماندوو نەبووە، لە زۆر وڵاتدا هێشتا چەوساندنەوە

ماوه، هێشتا چینی دەسەڵاتدار بەری ڕەنجی زەحمەتکێشان‌و کارگەرو جوتیاران دەخوات‌و ئەو چەوساندنەوەیە برسێتی‌و نەبوونی‌و نەخۆشی‌و ڕووتیی لەناو هەژاراندا بڵاوکردۆتەوە. بەڵام لەو وڵاتانەدا کە تێکۆشانی کارگەران‌و زەحمەتکێشان قەڵای ڕەنج خۆرانی ڕوخاندووەو زەحمەتکێش خۆی خاوەنی ڕەنگ‌و ئیش‌و نانی خۆیەتی ئەوا خەڵکی هەموو تێرو تەسەڵن، هەموو مەردانە ئیش دەکەن‌و ڕەنج دەدەن‌و خێرو بەرەکەت بەرهەم دێنن‌و دەستی ماندووی ئەوان هەمیشە لەسەر سکی تێرە. ئەم پەندە کوردییە بە گەلێك زمانی جیهان هەیە لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەم ناوەڕۆکە لە ئایەتێکدا دەفەرمووێت: (لیس للانسان الا ماسعی) واتە ئادەمیزاد ئەو شتەی دەست دەکەوێت کە ڕەنجی بۆ کێشاوە. ئێستا لە خاکی زەحمەتکێشاندا، لە وڵاتی ئیشتراکیدا ئەم مەبەسە بووە بە یەکێك لە یاساکانی ڕژێمی ئیشتراکی‌و دەڵێن هەموو کەس دەبێت ئیش بکات نەوەستێت، ڕەنج بکێشێت. دیارە ڕەنجەکەشی بۆ خۆیەتی، چونکە دەرەبەگ‌و سەرمایەدار نەماون، تا ڕەنجی بخۆن. ئەوانە نەماوون، کە وەك زەروو، خوێنی بمژن. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەموو کەسێکی چالاکی ئیشکەر ژیانی ڕووناکەو بەختیارەو خاوەنی ڕەنج‌و نانی خۆیەتی‌و هەموو کۆمەڵ، هەموو خەڵك دەستی ماندوویان لەسەر سکی تێرە.

## لە ئەدەبی جیهانەوە:

# دایــــك

(مەکسیم گۆرکی)

مەکسیم گۆرکی لە ئەدەبیە هەرە گەورەکانی وڵاتی سۆڤیەت دەژمێردێت. ئاشکرایە کە پایەیەکی بەرزی بۆ دایك داناوەو خۆشەویستی دایکی لە دڵدا چەسپیوە، سێ چیرۆکی خۆی کە هەر سێکیان دەربارەی دایكو قارەمانێتی دایکێتییە دوای خۆی بەجێ هێشتووە.

ئەم چیرۆکە بچووکە یەکێکە لەو سێ چیرۆکە. دووانەکەی دیکەیان یەکێکیان لاسایی نامەیەو ئەوەی دییان چیرۆکی گەورەی بەناوبانگی (دایك)ە کە بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێراوە.

## ئەمەش چیرۆکەکەیە:

# دایــــك

با زمان بە پیا هەڵدانی ئافرەتێك بکەینەوە، کە دایکە! دایك: سەرچاوەی ژیان!

ئەم چیرۆکە لە تەیموری لەنگی دڵرەقەوەیە: جیهانگیری، شەلی خۆشبەخت، کە ویستی هەموو جیهان ژێرەو ژوور بکات.

ماوەی پەنجا ساڵ هەموو جێگەیەکی تێکەڵ بە خوێن کرد. شارانو دەوڵەتانی لەژێر چەکمەی ئاسنینی خۆیدا وێرانکرد، وەك فیلێك پێ بەسەر شارە مێروولەدا بنێت... پێی دەنایە هەر شوێنێك، جۆگای خوێن بەدوایدا دەکشا، گەلێك کۆشکی بەرزکردەوە لە ئێسقانی (گەلە

بەردەسکراوەکان، لە تۆڵەی مەرگی (جانگیر)ی کوڕیدا، سێ ساڵی تەواو تۆز قالێك میهرەبانیو بەزەیی لە سوچی دڵیدا جێی نەدەبووەوە.

با زمان بە پیا هەڵدانی دایك بکەینەوە!. دایك: ئەو هێزەیە کە مەرگ سەری زەبوونی بۆ دادەنوێنێت، چیرۆکی ڕاستەقینە لەدایك بگێڕینەوە: دایك کە نۆکەرو خزمەتکاری مەرگ، تەیمووری شەلی دڵرەق، لە عاستی ئەودا سەری ڕێزو قەدری دانەواند.

دەشتی سەوزو زەڕنگاری (کانی گولان)، کە بە گوڵاڵەو بەیبون داپۆشرابوو شاعیرەکانی سەمەرقەند ناویان نابوو (دۆڵی گوڵ) لەو جێگەیەی کە منارە بەرزو شینەکانی شار لە دوورەوە دەبینران، تەیموور جەژنێکی گەورەی پێنج هەزار خێوەتی لە چەشنی بایەوان هەڵدابوو، کە لەبانی هەر یەکێکیانەوە بە سەدان ئاڵای ئاورێشمین دەشەکایەوە!.

لە ناوەڕاستی ئەم چادرانەدا، خێوەتی تەیموور وەك شاژنێك لەناو کارەکەراندا وەستابێت، لەسەر دوازدەهەستوونی زێڕ، کەهەر یەکەیان بە قەدەر درێژ باڵای پیاوێك بوو، هەڵدرابوو، لە چوار سووچی خێوەتەکەدا، (چونکە چوارگۆشە بوو) چوار هەڵۆی زیوینیان داچەقاندبوو، لە ناوەڕاستی ئەواندا هەڵۆی ئێنجەمین: پادشای پادشاهان، تەیموری دەسەڵاتدار، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتبوو، ڕووکاری وەکو دەمی خەنجەرێکی پان بوو، کە بە خوێن سوور کرابێت: خوێنێ کە بە هەزاران جار لێیەوە لکابوو.

تەختی خێوەتەکە بە جوانترینو نایابترین ڕایەخ داپۆشرابوو، سێ سەد بەرداخی زێڕینی پڕ لە شەرابیان دانابوو لەگەڵ هەر شتێکی نایابدا،

که بۆ خوانی پاشایەتی بە کەڵك بێت، بەزم گێرەکان لە پشتی سەری تەیموورەوە جێگای خۆیان گرت، لە تەنیشتەوە هیچ کەس دانەدەنیشت، نزیکانیو فەرماندەرانیو گەورە پیاوەکانی، هەموو لەبەر پێیدا دانیشتن.

نزیکترو خۆشەویست تر لەهەمووان (کرمانی) شاعیری سەرمەست بوو، کە تەیموور بواری دابوو لە هەڕەتی سەرخۆشیدا گاڵتە بە سەرداری گەورە بکات، ئەو پیاوە جەنگاوییە بە سامە بداتە بەر توانج... دەبا زمان بۆ پیا هەڵدانی شاعیری بکەینەوە کە لە خوای تاكو تەنیا بەولاوە هیچ ناناسێت، وە لە قسەی هەقدا کۆڵ نادات.

لە هەڕەتی جەژنو لە گەرمەی شانازیو گێڕانەوەی شەڕانو سەرکەوتنەکاندا، کە پیاوەکانی تەیموور نوقمی سامی ئەو بوو بوون، لە ناکاو هاواری ژنێك وەك قریشکەی تەوارێك، لە چەشنی بروسکە کە بەناو هەور دا تێپەڕێت، گەیشتە گوێچکەی بەی دەسکەری (سوڵتان بایەزید).

ئەم دەنگەی بەلاوە ئاشنابوو، وە کاریشی لە دڵە زامارەکەی کرد، کە مەرگ هێلانەی تێدا کردبوو، فەرمانی دا بزانن ئەم هاوارە دوور لە شادییە لە کیوەیە؟ وەڵامیان هێنا، کە لەژنێکی شێتی شپرزەوەیە، کراسێکی شڕی لەبەردایەو بە زبانی عەرەبی دەدوێتو دەیەوێت- بڵێ:

دەیەوێت- سەرداری گەورە ببینێت. فەرمانیدا، بیهێنن.

دوای پشوویەك، ژنەکە لە بەرامبەریدا وەستا، پێ خاووسو بەرگی شڕی لەبەردا بوو، پرچە شۆڕەکانی، سنگە ڕووتەکەی داپۆشیبوو، ڕواڵەتی وەك برنجە زەرد بوو، لە چاوەکانیدا گرنگیو لەخۆڕادیوی

دەبینـرا، دەسـتـە گـەنم ڕەنگـەکانی کـە هـەرگیز نـە دەلـەزرین بـۆ لای سەرداری شەل درێژ کردو، وتـی:

(ئەرێ تۆی سوڵتان بایەزیدت شکاندووە؟ گوێ بگرە، تۆ هەر چییەك بکـەیت، مرۆڤیـتو منـیش دایکـم! تـۆ مـەرگ دەچـێنیت، مـن ژیـان دەبەخـشم! گوناهـت دەربـارەی مـن کـردووە، مـن هـاتووم کـە لای مـن گوناهی خۆت بلاڵێیتەوە! بیـستوومە، کـە دروشمـی تـۆ (دادپـەروەریو دەسـەڵاتە) باوەڕناکـەم! بـەڵام ویـژدان گاڵتـە دەدات، کـە لەبەرانبـەری منداڵ گوێ ڕادێر بیت! من دایکم!...

سەرداری شەل ئەوەندە زیرەكو وریا بوو، کە پەی بە تەوژمی پـشت ئەم قسانە بەرێت.

بە ژنەکەی فەرموو دانیشێتو بەسـەرهاتی خـۆی بگێڕێتـەوە. ژنەکـە گوتی: (( من خەڵکی (سالرنۆ)م کەوا لە ئیتالیا لە وڵاتێکـی دوور کـە تـۆ شارەزایی نیت. باوکم ماسیگر بوو، مێردەکەشم هەر ئـەوە کـاریبوو، بـە دڵنیایی دەژیاو من مایەی بەختیاری ئەو بووم. منـداڵێکم بـوو لـە هـەموو منداڵان جوانتر بوو )).

لـەم وەختـەدا سـەرداری پـیر قـسەی ژنەکـەی بـڕیو گـوتی: ((وەك جانگیری کوڕم)) ژنەکە، گورجانە گوتی: (منـداڵی مـن لـەجوانیو ژێریـدا هاوتای نەبوو). شەش ساڵانە بوو، کە دزانی دەریا ڕژانە قەراخی دەریای ئێمەو خەزوریو من گەلێکی دیکەیان کوشتو کوڕەکەمیان ڕفانـد. ئەمـە چـوار سـاڵە دنیـای بـە شـوێندا دەپـشکنم کەچـی ئـەوەتا لای تۆیـە! بەوەشدا دەزانم، چونکە پیاوی بایەزید ئـەو دزە دەریاییانـە یـان گـرتو

ئەمجارە تۆیش بایەزیدت شکاندو هەرچییەکی هەبوو کەوتە دەستت. جا خاتر جەمم ئاگات لە شوێنی کوڕی من هەیەو لەسەر تۆیە بمدەیتەوە! ئەوانەی لەوێ بوون هەموو دایانە پڕمەی پێکەنین.

سەرکردەکانی سوپاو فەرماندەرانی وڵاتان کە خۆیان بە پسپۆڕ، دەزانی گوتیان: (ئەم ژنە شێتە! ماقوڵانو گەورەکانی هۆزیش دایانە پاڵ ئەوانو پشتوانیان لە قسەکەیانکرد، بەڵام کرمانی شاعیر. تەنیا کەسێك بوو، کە پێنەکەنی، بەڵکو وردبووەوە، بە بیرا چوو، ڕاستەوخۆ سەرنجی ژنەکەی دەدا.

تەیموری شەلیش بەسەر سوڕماوییەوە تێیدەڕوانی. ئنجا شاعیر لەژێر لێوییەوە، گوتی: (( بەڵی شێتە وەك ئەو ژنانەی جگەر گۆشەیان لە کیس چوو بێت!)). لە دواییدا فەرماندەری فەرماندەران، دوژمنی ئاسایشو هێمنی گوتی: ((ژنەکە! لەو وڵاتە نادیارییەوە چۆن گەیشتیتە ئێرە؟، دەست ئەو پیاوانەی، لە جانەوەری کێوی دڕندە ترن خۆت ڕزگار کردو بێ چەكو تەنیا ڕێگات گرتە بەر؟! چەك تەنیا پشتیوانی مرۆڤی بێدەسەڵاتەو تاقە دۆستێکە، کە ئینسان تا ئەو وەختەی بتوانێت بە چاکی بەکار بهێنێت گزیی ناکات!)). با سەر دانەوێنن بۆ گەورەیی ئافرەت، ئەو ئافرەتەی کە دایکەو خۆشەویستی ئەو تەگەرەو بەر هەڵست ناناسێت وە بە مەمکی خۆی ڕێگا لە دنیا دەکاتەوە. هەموو شتێکی باش لە ئادەمیزاددا بە ڕوو بۆی تیشکی ڕۆژو شیری دایکەوە ئەمەیە، کە خۆشەویستی ژیانمان فێر دەکات.

ژنەکە گوتی: (( من لە گەڕانەکەمدا هەر تووشی دەریاییەك بووم، کە ئەویش پڕ بوو لە دوورگەو گەمیی ڕاوی توانیم بە کۆمەکی ئەوان لێی بپەڕمەوە. مرۆڤ کاتێك بە شوێنی خۆشەویستێکدا دەگەڕێت هەموو شتێك ئامادە دەبینێت بۆ خزمەتی خۆی. پەڕینەوەی ڕووبار بە مەلە بۆ کەسێك، کە لە قەراخ ئاو هاتبێتە دنیاوە کارێکی ئەوەندە گران نییە)).

لەم وەختەدا کرمانی گوتی: ((... کۆسار بەلای خۆشەویستەوە، وەك دەشتو نەرمان تەخت دەبێت!)) ژنە لەسەری ڕۆیشت: وە تووشی جانەوەرانی سامناکی کێوی بووم، بەڵام هەموو جانەوەرێك دڵێکی هەیە، من لەگەڵ ئەواندا، هەر بەو جۆرە کە لەگەڵ تۆدا ئەدوێم، قسەم دەکرد، ئەوانیش وەختێ، کە دەمگوت دایکم، باوەڕیان پێدەکردم، دڵیان پێم دەسووتا، بۆچی جانەوەرانی دڕندەی کێویش بەچکەی خۆیان خۆش ناوێت! بۆ پاراستنی گیانیان تەقەلا نادەن؟!) ژنە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت: (( پیاو لەبەر چاوی دایکدا لە منداڵێك زیاتر نییە، تۆ دەکرێت حاشا لە بوونی خوا بکەیت)).

ژنە لەم کاتەدا قیژاندی: (( خێراکە! کوڕەکەم بدەرەوە، ئەمن دایکی ئەمو خۆشم دەوێت!))

با سەر بۆ گەورەیی ئافرەت دابنەوێنین. ئافرەتە کە موساو عیساو موحەمەدی خستۆتەوە، ئەوە کە گەورە پیاوان دێنێتە دنیا، جیهان بە هەرچییەکەوە بنازێت لەدایکەوەیە...

خاپوورکەری شاران، ئەو شەلە زۆردارە، کەوتە وتووێژی پاش بێدەنگییەکی درێژ بە وانەی لە دەوروبەری بوون گوتی: ((من تەیموری

خواپەرەست، ئەوەی پێویستە بگوترێت بە ئێوە دەڵێم: ماوەیەکی زۆر دەژیمو دنیا لەژێر پێمدا دەناڵێنێت، سێ ساڵە لە تۆڵەی جانگیری کوڕمدا دنیام خەڵتانی خوێن کردووە)) بەدرێژایی ئەم ماوەیە خەڵك لەبەر خاتری شارانو وڵاتان لەگەڵ مندا جەنگاونو هیچ کەس سەبارەت بە ئینسان بە گژمدا نەهاتووە! مرۆڤ هیچ کاتێك ڕێزو نرخی بەلامەوە نەبووە، من ئەو تەیموورەم کە لە پاش بەی دەسکرن، بە بایەزیدی گوت: بڕوا ناکەم شارانو خەڵکی شاران بەلای خواوە نرخێکیان ببێت، وە ئەو لە زنجیردا بوو من لە کاتێکدا ژیانم بەلامەوە وەك ژەهر تاڵبوو، تەماشای چارەڕەشی ئەوەم دەکرد، لەبەرامبەر یەکێکی وەك مندا ئەوەتا ژنێك دانیشتووە هەستو بیرێکی لەمندا هەڵگیرساندووە، کە تا ئێستا نەم دیوە بە خۆمەوە. ئەم بە جۆری لەگەڵ مندا دەدوێت، خێرخوازی منە، ئەم ناپاڕێتەوەو تکا ناکات، ئەم دەیەوێتو داوا دەکات. ئێستا ڕازی تەوژمی ئەم ژنە تێدەگەم، ئەم خۆشەویستی لە دڵدایە، ئەو خۆشەویستییە وای لێدەکات، کە منداڵەکەی بە ریشەی ژیانی.... بزانێت...

زۆردار، کە کوڕەکەی خۆی بیرکەوتبووەوە، دەیناڵاند، لە دوای پشوویەك ڕوویکردە پیاوەکانیو گووتی: ((هەر ئێستا سێ سەد سوار لە سەرانسەری ناوچەی فەرمانڕەوایی مندا بۆ دۆزینەوەی کوڕی ئەم ژنە، بکەونە ڕێ، ئەم ژنە لێرە دەمێنێتەوەو منیش بە دیاریەوە دادەنیشم تا کوڕەکەی دەدۆزێتەوە، خۆشی لەو کەسەی کوڕی ئەم ژنە بێنێتەوە)). ژنە بزەیەکی بۆ کردوو، ئەویش کشومات سەری بۆ ژنەکە دانەواند، کرمانیش دەس بەجێ دەستە شیعرێکی تاریخی ژنێکدا کە عەشقی دایکانەی لەسەردایە خوێندەوە.

** ** **

... ئەمە هەموو وایە: هەر وشەیەك كە لێرەدا دانراوە ڕاستە، دایكانی ئێمە ئەمە دەزانن، لەوان بپرسە پێتدەڵێن:

((بەڵێ ئەمانە ڕاستن، لەسەرەتاوە، ڕاستبوونو هەتا هەتایە ڕاست دەبن، ئێمەی دایكان لە مەرگ بەهێزترین، ئێمەین كە بۆ دنیا هەمیشە پسپۆڕو شاعیرو پاڵەوان دێنینە بەرهەم، وە هەر شتێك كە مرۆڤ لە سایەیدا بگاتە سەربەرزی، شانازیی پێدەبەخشیین...)).

## لێكدانەوەی وشەكان:

| | | |
|---|---|---|
| چەكمەی ئاسنین | : | جۆرە پێڵاوێك بوو |
| گوڵاڵەو بەیبوون | : | گوڵ تەخوێنو بەیبوون |
| بایەوان | : | خێوەتی پاپۆڕ |
| تەوار | : | هەڵۆی مێ |
| بلاڵێیتەوە | : | بكەڤی زارەزار |
| كوسار | : | دەشتی بن چیا |

## گفتوگۆ:

١. لەبەر چی دایك بەلای (مەكسیم گۆركی)یەوە ئەو پایە بەرزەی هەبووە؟

٢. تەیمووری دڵرەقو شاران خاپووركەرو خوێنرێژ چ هەڵوێستێكی نواند بەرامبەر دایكەكە؟

٣. مەبەستی (مەكسیم گۆركی) لە چیرۆكەكە چییە؟

٤. ئایا دەتوانیت چەند دێڕێك دەربارەی ژیانو بەسەرهاتی (مەكسیم گۆركی) بنووسیت؟ هەروەها دەربارەی چیرۆكە گرنگەكەی (دایك) چی دەزانیت؟

# پێرست